# مەرگەمووش

کورتە چیرۆک






موکەرەم رەشید تالەبانی

# مەرگەمووش

ناوی کتێب : مەرگەمووش
بابەت : کورتە چیرۆك
نووسەر : موکەرەم ڕەشید تاڵەبانی
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
یەکەمین چاپ ٢٠١٥
نەخشەسازی : ئەحمەد سلێمان
نرخ : ٣٠٠٠ دینار
چاپخانەی شەهاب – هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٨٣٢)ی ساڵی ٢٠١٤ی دراوەتێ

## پێشکەش

پێشکەشە بە جگەرگۆشەکانم

بە هاوسەرەکەم

بە هاوڕێ دڵسۆزەکانم

بە خامە نەترسەکان

بە ئاڵای کوردستان

بە خەونی گەشی کوردان

بە چیا سەر بڵندەکانی کوردستان

# تەوس

هەتاو تازە بەتیشکە زێڕینەکانی لەگەڵ خانوو و دارو درەختی دەوروبەردا سەرەتاتکێی دەکرد، ئەم گینگڵی داو لەسەر پشت بەلای چەپدا وەرچەرخایەوە، سەرنجێکی لەکاتژمێرەکەی مەچەکی دا.

هێشتا ماوەتی باتۆزێکی دیکەیش بنووم.

چاوی نوقاندەوە، بەڵام زەنگی مێشکی لێی دا (دە هەڵسە ئەوە ناهێنێت، خۆت پۆشتە بکەرەوە، ناوی خوای لێ بێنە.. ڕێ بگرە بەر) بیری کەوتەوە ئەم ڕۆ شەممەیە (لەوانەیە ئۆتۆمبیل دەست نەکەوێت سەر لەبەیانیی شەمموان زۆر جەنجاڵە..).

لەسەر نوێنەکە ڕاپەڕی، دارخورمای بالآی هەڵچوو، بێ بانیی شەو کاری لەپشتی کردبوو، دوو سێ هەنگاوی هاویشت، پەنجەی لەدوگمەیەك دا، بەلای چەپدا سووڕاندی، دەنگی پانکە بن مێچییەکەی کپ کرد، بە هێواشی چەند پلەیەك چووە خوارەوە، بەلای چەپدا وەرچەرخا، دوگمەیەکی داگیرساند، کاری پێویستی ئەنجام دا، پەنجەی بەدوگمەکەدا نایەوە چاوی ڕووناکییەکەی کوژاندەوە، یایەکی بادا، ئاو لەوەڵفەکە فیشقەی کرد، دەم و چاوی پێ تەڕکردو، سابووناوەکەی پێ ڕەواندەوە، خوڕەی لەئاوەکە بری، بەپەشتەماڵەکە دەم و چاوی هشك کردەوە.

هـەمان پاچـینەی گـرت، خـۆی لەژوورەکـەدا پۆشـتە کـردەوە، جانتـا دیبلۆماسـییە سـوورەکەی هـەڵگرت و، لەسەرخۆ هەنگاو هەنگاو نزم دەبووەوە، پێی لەسەر کاشیی ڕێڕەوەکە گیرسایەوە، سەری بەمووبەقەکەدا تەقییەوە، کە لێوەی دەچێتە دەرەوە، دەسـتی بـرد کلیلەکـەی لەسـەر مێزەکـە هـەڵگرت و. دەرگـە کلـۆم دراوەکـەی پـێ خسـتە سەرپشت. نەیهێشت جیڕەی لێوە بێت، تا خانەخوێکەیان لەخەو نەبێتەوە، بەهەمان شێوەیش پێوەی دا، گوێرەوی و پێڵاوەکـەی هـەڵگرت، لای وەڵفـی باخچـەکەدا گیرسـایەوە، پێی شوشت، گوێرەوی و پێڵاوەکەی لەپێ کردن.

لەدەرگـەی دەرەوە دەربـاز بـوو، تیسـکەیەك بـوو تێـی تەقانـد، ئافرەتێـك بەقۆنـدەرە پـاش بەرزەکانیـەوە تـەق و تۆقێکی سەرنجڕاکێشـەری خسـتبووە ئـەو نـاوە، گرتیـەوەو بەتیلـەی چـاو سـەرنجێکی نیوەنیگـای لەڕوومـەت و قـژو پەرچـەمە شـانەکراوەکەی دا، ڕووی وەرچـەرخاندو تێـی تەقاند، لەوبەری جادەکەوە بەخۆی و جانتاکەیەوە چەقی.

خەڵکەکە لەژمارەی پەنجەی دوو دەست تێ نەدەپەڕین، ژن و پیاو، کورو کچ وێستگەکەیان تەنیبووەوە، تا دەهات ژمارەیان پەرەی دەستاند، هیچ ئۆتۆمبیلێك ڕانەدەوەستا، پاسە دوو نهۆمە سوورەکانیش، وەك مانیان گرتبێت، ئەم بەیانییـە دیـار نـەبوون، هـەژدە نەفـەری و بیسـت و سـێ نەفەرییـەکانیش سـیخناخ بـوون، ڕایـان نـەدەگرت، پێـی چـاوەڕوانی شـل بـوو، تـا دەهـات خەڵکەکـە . وەك شـارە

زەردەواڵە دارت پێدا کردبێت . لەم لاو لەو لاوە دەهاتن، بەوێستگەکەوە دەنووسان.. بیری کەوتەوە. لەدڵی خۆیدا گوتی:

- ئەمڕۆ ڕێڕەوو کەژاوە هەیە، پێشوازیی خوێندکاران دەکرێت، بۆیە پاسە سوورە دوو نهۆمییەکان دیار نین!

دەتگوت کووپەڵەیەک لیرەی ڕەشادیی دۆزیوەتەوە، ویستی بانگ بۆ خەڵکەکە بدات و، ڕاستیی نەبوونی ئۆتۆمبیلیان بۆ ڕوون بکاتەوە، کەچی هێزێک لەناوەوە بەگوێوەی چرپاند (تۆ چیت بەسەرەوەیە، تۆ بڵێیت خۆیان نەزانن؟)

چەند جارێک هەڵمەتی چەند ئۆتۆمبیلیان دا سواربن، تومەز هیی کریێ نەبوون، پاشەکشێی پەشیمانییان دەکردەوە، لەناکاودا هەژدە نەفەرییەک لەتەنیشتیانەوە ڕای گرت.. هەڵیان دایە، لێی ئالان، چوون هەنگ لەکوورە هەنگ ئالابێت، بەتەپەتسکێ جێی خۆی کردەوە، چەند کەسێک نائومێد بوون.. کشانەوە.

چەند جارێک ئۆتۆمبێلەکە لەڕێگەدا ڕاوەستاو خەڵکی دابەزاندو خەڵکی سوارکرد. گەیشتە جێی مەبەست. ئەویش دابەزی، تەماشای ئەو خەڵکەی دەکرد، هەریەکەو بەرەو شوێنی کاری خۆیان و، هەرکەسەو ڕووەو لایەک هەڵتەک هەڵتەکیان بوو.

قۆناغێکی دیکەی مابوو چاوەڕوانی نەکرد، ڕیزی ئۆتۆمبیلەکان درێژە مارێک بوو خەڵکەکە دەهاتن و،

دەچوونە ناو سکیەوە، ئەویش خۆی بە قوڕگی یەکێکیاندا کرد، نزیک بەو دەزگەیەی ئیشی تێدا دەکرد دابەزی، بەچەند هەنگاوێك لەدەروازە گەورەکە چوو بەو دیودا.. چەند پاچینەیەك سەرکەوت، سووڕایەوە. ڕاست ڕۆیشت، خۆی بەژوورێکدا کرد ڕۆژباشی ئافرەتە مووچەخۆرەکەی کرد، وەڵامی درایەوە، جانتاکەی لەسەر مێزەکە ڕاکشاند، ڕۆیشت قومێك ئاوی ساردی بەئاگری دەروونیدا کرد. بەرەو ژوورەکەی گەڕایەوە، لەسەر تەختەکە مت بوو. خەریکی ڕەش کردنەوەی چەند پەڕەیەك بوو، زۆری نەبرد تەلەفۆنە ڕەشتاڵەکەی هەڵگرت:

- کاك هاوار ئەگەر بڵند چووە دەرەوە ئاگادارم بکە.. منیش دێم.

ئەسپی پێنووسەکەی لەسەر لاپەڕەکان تاو دەدا، زرینگەی تەلەفۆنە ڕەش ڕایچەڵەکاند، پڕی دایەو بەگوێوەی نا، دەنگەکە گوتی:

- کاك ژێوار ئامادەبە وا بڵند دەردەچێت، وەرە خوارێ. ڕاپەڕی. هەنگاوەکانی گورج کردەوە، پێیەکانی پاچینەکەیان قووت دەدا، لەبەر دەرگەکەدا جڵەوی ڕێی ڕاگرت، بەڕێ کەوتن، لەدەرگاەکان دەربازبوون، ئۆتۆمبیلە سوور ئەسپێکی ڕازاوە بوو، خۆیان تێ ئاخنی کەوتە ڕێ، برسییەك بوو شەقامەکەی قووت دەدا، لەترەفیك لایتەکە، گڵۆپە سوور ستۆپی پێ کرد. کە گڵۆپە سەوزەکە ڕێی پێدان، ئۆتۆمبیلەکە شەقامە لووسەکەی هەڵدەلووشی،

سووڕانەوەیەك دووان، لەبەر دەرگەی پشتەوە دەزگا چاپەمەنییەکە ڕاوەستا، ملی نیازیان ناو پێیان لەسەر زەوی گیر بووەوە.

وشەی (فەرموو، فەرموو) پێشیان کەوت، تێکەڵی گۆڕەپانی دەزگەکە بوون، هەریەکەو دووان سەریان بەژوورێکدا کرد، ئەویش بۆ لای لێپرسراوی بڵاوکردنەوە تێی تەقاند، دەرگەیەکی لادا، چەندین مووچەخۆری ئافرەت و پیاوی بینی، هەرکەسەو لەپشتی مێزی خۆیەوە دانیشتبوو، کاری خۆیان ڕادەپەڕاند، چاوی بەئافرەتێکی ناسراو کەوت، چاك و چۆنی لێك نزیکی کردنەوە، لێپرسراوی بڵاوکردنەوەی پێ پیشان دا.. ڕووی تێ کرد، پاش سڵاوو بەخێرهاتن، لەسەر قەنەفە هەنگوێنییەکە گیرسایەوە، پرسیارەکان لەشانەکانی مێشکیدا دڵە خورپێیان بوو.

- مامۆستا پەرتووکێکم لێرە چاپ کراوە، هاتووم دانەکانی خۆم وەربگرم.

پەرتووکەکەت (.............)؟

بەڵێ (............) بەناونیشانی (.............)یە.

گازی ئافرەتە تێك سمراوەکەی کرد، پێی ڕاگەیاند هیچ چێکێك بەناوی خاوەندی پەرتووکەکەوە کراوە؟

- نەو هێشتا هیچ دەست و بردێك نەکراوە. دووسبەی وەرەوە چێك و دانە پەرتووکەکانی بەشی خۆت وەربگرە.

باشە، چەند دانە پەرتووکم پێ دەبەخشن، پاداشتەکەی چەندە؟

- (........)دانە، پاداشتی هەر شازدە لاپەڕە (........) دینارە.

سەری بۆ لەقاندەوە، هەڵسایە سەرپێ و، توند دەستی گوشی و ماڵئاوایی لێ کرد، دەرگەکەی لەدووی خۆی پێوە دا، چووە لای برادەرەکانی، خەریکی ماکێت و ڕاست کردنەوەی هەڵەو دەرکردنی نیمچە ڕۆژنامەو (پلیت)ێک بوون، شوفێرەکە تێی تەقاندبوو، زۆر دانیشت، تاقەتی چوو، سەرێکی لەچاپخانەکەی ئەو دیوەوە دا، دانەیەکی پەرتووکە چاپکراوەکەی خۆی وەرگرت، گەڕایەوە هەمان جێ، چاوێکی بە لاپەڕەکاندا خشاند، چەند هەڵەیەکی چاپیی ڕاست کردەوە. خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان نزیک ببووەوە، شوفێرەکە نەگەڕابووەوە.

ئۆقرەی لێ بڕابوو، پەلەی بوو بگەڕێتەوە دەزگەکەی خۆی، کە شوفێرەکە وەك دۆمەلان هەڵتۆقی، هەموو هەستانە سەرپێ، ژوورەکەیان خاڵی کرد، چەند دەروازەیەکیان تێپەڕاند، ئۆتۆمبیلەکە سکی خۆی لێ پڕ کردن. بەرەو دواوە هەمان ڕێگەی هاتنی گرتەوەو سووڕانەوەیەك، دوو، سێ، لەبەر دەزگەکەدا هەڵتۆپزی، دەرگە شووشە بەندەکەی پاڵ نا، بە ژوور کەوت. کیژە مووچەخۆرەکەی پرسگەکە ڕاوەستابوو، گەردنی بۆ

تەماشای کاتژمێرەکەی قەد دیوارەکە بەرزکردەوە، ئەمیش لەدڵی خۆیدا گوتی:

- زۆرم پێ نەچووە، چووار سەعاتی ڕەبەقم کوشتووە!

بەستەزمانە، حەزی نەکرد، شوفێرەکە بەجێی هێشتبوو. کارەکەی بۆ دوو سبەی دواخرابوو، هێمنی باڵی بەسەر ژوورەکەیدا کێشابوو، دەم و دووی برادەرانی تاقی کردەوە، کەس تەلەفۆنی بۆ نەکردبوو، کەسیش هەواڵی نەپرسیبوو، شاکار نەبێت تەلەفۆنی کردبوو، کەسی لێ نەبووبوو، ئەمی ویستبوو، کیژەکە وەڵامی دابووەوە:

- هەموویان چوونەتە دەرەوە کەسیان لێرە نین، گەر هاتنەوە چییان پێ بڵێم؟

- قەیدی نییە، خۆم تەلەفۆن دەکەمەوە.

کاتی دەوام بەرەو کۆتایی دەچوو، تەک مووچەخۆرەکاندا پشتیان لەدەزگەکە کرد، ڕژانە شۆستەکان، هەریەك و دووان بەرەو لایەك.

لەشۆستەکەی ئەوبەرەوە لەنگەری گرت، ئۆتۆمبێلێکی شین بۆی ڕاوەستا، خۆیی تێ ئاخنی، دوو پەنجایی لە لەپی شوفێرەکە نا، لەوێستگە گشتییەکە دابەزی، خۆی بەچێشتخانەیەکدا کرد. تەرمی برسێیەتیی ناشت، نیو دیناری لێ وەرگیرا، ڕووی لە دەرێ کرد. (با جارێك چیا نەخۆمەوە، لەشوێنێکی کە دەیخۆمەوە) شەقامەکەی بڕی، پاسێکی سووری بەدی کرد، تێی ورووژابوون، ئەویش خۆیی تێ ئاخنی) لەشوێنی مەبەست دابەزی، سێبەری

تاریکە بازاڕێك هەڵی لووشی، دوو کۆڵانی بری. لەشەقامی ئەنتیکــە فرۆشــەکان ســەری قــوت کــردەوە، بــەدووی جانتایەکی منداڵاندا چاوی دەگێڕا، بۆ کیژەکەی بکڕێت کە تــازە چــووەتە قوتابخانــە، چــاوی بەهــەموو فرۆشــگەکاندا هەڵدەواســی، ئــەو جــۆرە جانتایــەی دەســتگیر نــەدەبوو، لــەپایینی شــەقامە درێژەکــەوە هەڵوەســتەیەکی کــرد، لەچاخانەیەکی سەرە ڕێ پیاڵە چایەکی بەو دیو گەروودا کـرد (ئێسـتە لێـرەوە دەڕۆم، ئـەو شـەقامەیش دەگـەڕێم تـا پایینی گۆڕەپانەکە غل دەبمەوە، گەر دەستم کەوت باشە، گـەرنا ئـەوە بیرێکــی دیکـەی لێ دەکەمـەوە) کـە لـەپایینی گۆڕەپانەکـە هـەڵنووتا بیرێکـی دیکـەی بـۆ هـات، سـواری پاسێك بوو. لەئۆتۆمبیلێکی دیکە دابەزی (ئالێرە لێیـەتی، ئێستە دەیکڕم و بەرەو ماڵی خانەخوێکەم دەبمەوە).

چــەند بــازاڕێکی تــێ پەڕانــد، لەبــەر فرۆشــگەیەکدا هەڵتۆپزی، دوو جۆر جانتا هەبوون، یەکێکی پەسەندکردن، کاغەزێکی چاوسووری پێ دا، دوو پەنجاییان بۆ گێڕایەوە. بۆ دوایەمین جار ئۆتۆمبیلێکی شین لەئامێزی گرت.

لەســەر کۆڵانەکــە دابــەزی. تەنگەبەرییەکــە قــووتی دا، لــەماڵی خانەخوێکــەی گیرســایەوە.. چــایەکی هەڵقوڕانـد، سەرکەوتە ژوورەکـەی سـەرەوە، سـکی جانتاکـەی هەڵـدڕی، دوو ســێ پــەرتووك و گۆڤــاری لێ دەرهێنــا، گۆڤارەکــانی هەڵدایەوە یەکێکی لێ هەڵبژاردن، دوو وتارو چەند هۆنراوەو چیرۆکێکی لێ خوێنـدەوە. سەری لەسـەر سـەرینەکە نـابوو،

بەسەر نوێنەکەدا درێژ ببووەوە، چاوی تەك وشەکاندا چاوەشارکێی دەکرد. هات و چۆی ڕۆژ ماندووبوونێکی زۆری بەدەمارەکانی خوێنی لەشیدا کردبوو. وشەکان لەبەرچاوی ڕەشکەوپێشکەیان دەکرد.

لەناو حەوشەیەکدا خۆی بینیەوە، چەند کیژو چەند ئافرەتێك لەو ناوە بوون، ئافرەتە ڕەشتاڵەکە مەشکەی دەژەنی، کیژەکان لەم لاو لەولاوە ڕاوەستابوون. کیژێکی بینی بە زمانەکەی ئەوان دووا، ئەویش بەزمانەکەی ئەم قسەی لەگەڵ کرد. سەری سوڕما لەولاتێکی ڕۆژئاوادا ئەو زمانی ئەم بزانێت، کیژەکە لەگەڵ دەستە خوشکێکیدا بە زمانێکی دیکەی ڕۆژهەلاتی دووا لێی پرسی:

چۆن فێری زمانەکەی ئێمە بوویت؟

. بەخوێندنی کتێبی فێربوونی زمان؟

خۆیی پێ ناساند. باسی وێژەو هۆنراوەو نووسین هاتە کایەوە. هاتە سەر باسی پەرتووکە نوێیەکەی. ویستی دانەی نێو جانتاکەی پێ نیشان بدات. ئەم لا جانتا، ئەو لا جانتا، جانتا ببووە پارووییەك و قووت درابوو.

لەحەوشە هاتە دەرەوە. جانتاکەی بەدەستی کوڕی ژنە ڕەشتاڵەکەوە بینی، لەلمی ئاخنیبوو، لەناوەڕاستەوە هەڵی تلیشاندبوو. چەند منداڵێکیش تەك کوڕەکەدا لەدەوری جانتاکە خۆڵە پۆتانێیان دەکرد، هەردوو چاوی پەڕینە تەوقی سەری، جلەوی ئاگەیی لەدەست دەرچوون هاواری کرد. بەسەر ژنە ڕەشتاڵەکەدا قیڕاندی.

- خوا چۆن هەڵ دەگرێت، کوڕەکەت وای لەجانتاکەم کردووە. تەسکەرەو شت و مەك و پەرتووك و پێویستییەکانی لەناوبردووم.

جانتا دڕاوە پڕ لە لمەکەی بۆ لای ژنە ڕەشتاڵەکە برد. ڕەنگی غەم و خەفەت دایپۆشی، تەوس بردیەوە، هۆڵی لێ هات. تەسکەرەکەی دڕاوە. هیچ ناسنامەیەکی نەماوە، چۆن بۆ ماڵ بگەڕێتەوەو لەپرسگەی پشکنینەکان بپەڕێتەوە. خۆ ئیدی ناتوانێت منداڵەکانی ببینێت.

هاواری کرد. قیڕاندی، تەنگە نەفەس بوو. خەریك بوو سنگی کپ ببێت.

گینگڵی دا.. جووڵایەوە.. ئاگادار بووەوە.

تەماشای کرد پەنجەی لەسەر دێڕێکی ناوەڕاستی وتارەکە ڕاگرتووە. خەوی ماندوویەتی جڵەوی لەدەست سەندووە. لەلای دەستی چەپیەوە جانتاکەی بینی پێی پێ دەکەنی!!

بەغدا - هاوینی ١٩٨٧

# مایکرۆفۆن

کابرا بەدەستی خۆی نەبوو، ئەوەندەی حەز لەڕوخسارو دیمەنی مایکرۆفۆن دەکرد، بگرە لەخەویشدا هەر فووی بەمایکرۆفۆندا دەکرد، بۆیشی بکرایە وەسیەتی دەکرد لەناو کۆمەڵێك مایکرۆفۆندا گۆڕی بۆ هەڵبکەنن. ڕۆژگار هات و ڕۆژگار چوو، کۆڕان بەستران و، ڤیستڤاڵ و ئاهەنگان سازدران، ئەوەند فووی بەمایکرۆفۆندا کرد، دەنگی گیراو، دەزووی دەنگ و دەماری گەرووی ئاووسان هەیانبوو پچڕان. لەگەڵ ئەوەیشدا تۆبەی نەکرد.

ڕۆژێکیان هۆڵەکە جمەی دەهات، دەرزیت هەڵدابا سەر زەوی نەدەکەوت، مایکرۆفۆنەکان دەنگیان ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت، چلەی ماتەمینی شاعیری ناودار بوو.

کابرایش یەك بەیەك وتارو پەخشان و هۆنراوە خوێنی پێشکەش دەکرد.. تا گەیشتە ئەوەی دوا لالانەوە بخوێنرێتەوە. لەگەڵ دەنگ هەڵهێنانی یەکەم وشەدا لەتەنیشت مایکرۆفۆنەکەوە لنگاو قووچ کەوت.. دەماری گەرووی پسان.. لەچلەی شاعیردا.. گیانی سپارد..!!

هەولێر- ١٩٨٩

# بۆن

بەبازاڕە جەنجاڵەکەدا تێدەپەڕی، کۆگە ڕازاوەکان سەرنجیان بۆلای خۆیان پێ گواستەوە، ئافرەت و کیژە مانگ ڕووەکان ئەم کۆگەو ئەو کۆگەیان دەکرد، سەواو مامەڵەی گەردانەو بازن و بانزلفی و گوارەیان دەکرد.

ئافرەتێکی نیو باڵ ڕووت، خۆی و دەستە خوشکەکەی بەبەردەمیدا گوزەریان کرد، شووشەیەك بۆنی نایابی گرانباییان کڕیبوو، ئەمیان بەدەستیەوە بوو پیشانی ئەوی دیکەی دەدا..

ئەمیش لەلای خۆیەوە کە ئەوی بینی، بەبیریدا هات" بۆچی نەچێت بۆنێك بکڕێت؟..

ئەگەرچی بەدرێژایی ژیانی، وەك بەبیری بێتەوە.. بۆنی نەکڕیوە، بگرە بۆنیشی لەخۆی نەداوە!! بەڵام بڕیارەو داویەتی و پێی بەجەرگی خۆیدا ناوە.. دەبێت هەر بیکڕێت..

خۆی بەکۆگەیەکی بۆن فرۆشتندا کرد، پەنجەی بۆ بۆنێکی هەرزان بایی ڕاکێشا، خاوەند کۆگەکە بۆنێکی نەختێك گرانتری پێ پیشان دا..

بۆنەکەی کڕی و، وەك بڵێیت دوو باڵی لێ پەیدا بووبێت، تیسکەی تفەنگ ئاسا ڕێی بەرەو ماڵەوەی گرتەبەر، بیری لەوە دەکردەوە، چۆن مژدە بەدایکی منداڵەکان بدات کە بۆنێکی نایابی کڕیوە.. لەو بیرۆکانەدا بوو پێی لەشۆستەکە

هـەڵنووتا.. شووشـە بۆنەكـەی لەدەسـت بـەربووەوەو بـەر بـەردێك كـەوت و تەقییـەوەو پارچـە پارچـە بـوو.. تۆزێـك لەبۆنەكەیشی بەر لووتی نەكەوت!!

هەولێر. هاوینی ١٩٨٩

# ئەمپراتۆر

پێشەکی:

(ناوونیشانی ئەم چیرۆکە، دوور یان نزیک پەیوەندیی بەئەمپراتۆری ژاپۆنەوە نییە، تەنیا لەنەخۆشییەکەدا نەبێت، کە چاک نابێتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی ئەم ئەمپراتۆرەی پاڵەوانی چیرۆکەکە، نەخۆشە، چاوەڕێی مردن دەکات، ئەگینە هیچ کۆششێکی نەکردووە، ئەو ناوەی وەرگرتبێت، بەڵکوو بەزۆری زۆردارەکی ئەو ناوەی بۆ خۆی زەوت کردووە؟).

(١)

لەگەڕەکەکەماندا، دەنگ و باسی وا بڵاوبووەوە، کە ئەمپراتۆر پەکی کەوتووە، چاوە کزەکانی نوقاندوون، دەست و پلی شل بوون، هەست و هۆشی لەدەست داوون، لەپەل و پۆ کەوتووە، بەسەر لاشە سڕو ماندووەکەیدا، وا وەیلیّ و شینە، لەخۆدان و سنگ کوتان و گرینە، گەورەو بچووک هورووژاوون، ڕۆژی زیندووبوونەوەیە، کەس دەستی لەئیش و کار ناچێت، هەموو بەدووی هاڵ و هەواڵی ئەمپراتۆردا ئەڤداڵە، نەوەك لەناکاودا کۆچ بکات، گیانی نەگریسی بەدەستی ئبلیسەوە بدات!!

(٢)

لەپڕ جاڕ بەگەڕەکدا درا.

خەڵکینە.. خەڵکینە، تا هەمووتان سەر بۆ کوێخا بلەq..
ببوورن ئەمپراتۆر دانەنەوێنن، کڕنووش نەبەن، هۆش و ڕەفتاری ڕۆژانەتان نەخەسێنن، ئەگینە ئەم دەردو برینە ساڕێژ نابێت!!

خەڵکەکە سەریان سوڕما، هەواڵ و جاڕدانی لەو چەشنەیان نەبیستووە، سەدان کوێخای کوێر هاتوون و چوون، کەس کڕنووشی بۆ نەبردوون، کەس زاری نەتەرەکیوە، کەس دوومەڵی لەزمان هەڵنەتۆقیوە..

چەندان پرسیار.. لەچەندان زار.. سەریان قوت کردەوە.. نیشانەی سەرسوڕمانیان دەبردەوە..

- تۆ بڵێیت ئەم کوێخایە نەخۆش بێت؟!
- نەو کوێرایی دڵی داهاتووە!!
- نەتانزانی، ڕێوییەکە سەدو یەك فێڵ پتر دەزانێت!
- ئەم نەخۆشییەش فێڵێکە لەفێڵەکانی!!
- نەو لەهەزاران ڕووباری داوە، قاپی تەڕ نەبووە! خۆی نەخۆش خستووە!!

- بەخۆوەی نەدیتووە، وا دەزانێت بەتەرە دۆینە دەمی جووتیارە هەژارەکان دەنووقێنێت! ئا بەو جۆرە ئاگری ئەو دەنگ و باسە کەوتە زارانەوە. کۆڕو دانیشتن و، دیوەخانان بۆ یەك دیان دەهەنادرو پەرت دەکردەوە، ببووە بنێشتە شیرینەی ژێر ددانی پیرەمێردو کوڕو کاڵان..

(٣)

ئەگەرچی گەڕەکەکەمان تازە تەلەفۆنی بۆ ڕاکێشرابوو، کەچی ئافەرتەکانی گەڕەك، ئەوانەی لەسەر کۆگەی ئەو خوارەی گەڕەکەوە، یەك دیان دەبینی و هەواڵی ئەو دەنگ و باسە سەیرەیان لەیەك دی دەپرسی.. شەوانیش بەتەلەفۆن بۆ یەکدییان باس دەکردو، چی هەواڵ و زانیاریی دیکە هەبوون کوت و پڕ بۆیەکدییان دەگوت و دەگواستەوە..

خاتوو (زارا) شەو نەبوو تەلەفۆنە ڕەش تاڵەکە بەگوێوە نەنێت و، هەواڵی ئەو ڕۆژەی گەڕەك سەبارەت بە ئەمپراتۆری نەخۆش بۆ (ڕەشکە) خانم نەگوێزێتەوە..

. دەڵێن ئەمڕۆ ئەمپراتۆر کەمێك هۆشی هاتووەتە سەر خۆی، هەرئەوەی بۆ کراوە، بەدوویدا ناردم.

. بەڕاستتە، ئەی ڕەنگ و دووی چۆن بوون؟

. بەگیانی تۆ ئەو ڕۆژە، چاوە قیچەکانی بزەیان دەهات، بۆنێکی مل شکێنەری لەخۆ دابوو، بۆینباخەکەی بۆ نالێیت، ئەوەند جوان بوو لە (تۆکیۆ)وە بۆیان هێنابوو!!

. بۆئەوەی بڵێن بەڕاستی لەئەمپراتۆر دەچێت!

. کچێ وا مەڵێ.. دیواریش گوێی هەیە.

. ئارەزووی خۆیەتی.. بەخوا من دەیڵێم.. هەرچی ڕاستە ئەوە دەڵێم، بەسپی دەڵێم سپی و بە ڕەش دەڵێم ڕەش.

ـ کچێ نەکەیت، دەستم داوێنت، من خۆشم دەوێیت، ئەگینە قۆرتێکت بۆ دروست دەکەن!!

- منێك كە ئەو پشتم بگرێت كەس ناتوانێت قۆرتم بۆ هەڵبكەنێت!!

من ئەوەی لەسەرمە پێم گوتیت، ئیدی دەمێنێتەوە لای تۆ!!

(٤)

لەپڕ تەلەفۆن داخرا.. ئەم جار لەسووچێكی دیكەوە، دوو ئافرەت بۆ یەكدییان باس دەكرد..

دەڵێن ئەم ڕۆ ئەمپراتۆر كەیفی هەیە.

- نەتبیستووە؟

- چی ڕووی داوە؟!

- كیژەكەی (قالە) بازرگان، ئەو چاوڕەشە قژ زەردە، پەنیر ڕەنگە، ئەمڕۆ سەری لەئەمپراتۆر داوە!!

- نەڵێیت، دیارە تێر مژی لەكانیاوی سازگاری ناوە!

- نەك هەر ئەوە، بەڵكو چی ئاڵۆشی لەشی هەبووە، بەدەست و پەنجە نەرم و نۆڵەكەی بۆی دامركاندووە!!

- دەڵێم ئەمڕۆ چوومە لای، ئارەزووی جارانی نەبوو، لەگەڵم بدوێت، تومەز ئەمە لەلایەكی دیكەوە پارووییەكی چەوری بۆ هاتووە!!

- چەور، ئەمان چەور!!

- قەیدی نییە، دەبێت من دەوەرەی دەردی بەرم!!

(٥)

لێرەدا تاریکایی کەوتە سەر ئەو دیمەنەو چرای ڕاستی لایەنێکی دیکەی ژیانی ڕەشی (ئەمپراتۆر)ی ڕووناک کردەوە..

دوو ئاسکۆڵەی دێ.. بەتەواوەتی هەڵچووبوون و چاویان ئاگری لێ دەباری و پشکۆ لەدڵیانەوە کڵپەی دەستاند.

ـ ئەو چاو قیچە هەروایە، دەیەوێت دەمی چەور بکات و، لەگۆشتمان بخوات و، دەستێك بەسەر قژی ئارەزوومانـدا نەهێنێت!!

ـ من هەر لەزووەوە دەمزانی، ئەو ڕابوردوو پووچە، بەرخەلەوانی بەکوێخا بوو، ئەم جار بەنازناو ئەمپراتۆر، وای لێ بەسەر دێت، پێشینان ڕاستیان گوتووە (ڕێوی لەکونی خۆی هەڵگەڕایەوە، گەڕ دەبێت) کەچی بەرانبەر بە ئەمپراتۆر ئەم پەندە دۆش داماوەو هیچ گەڕبوونێك لەئارادا نییە!!

ـ کچێ کەمێك ئارامت هەبێت، ڕۆژان دەوران دەورە، کەمێك بکە سەبرە!!

چرای ڕاستی لەوێوە بۆ لایەکی ئەولای گەڕەك گوێزرایەوە.. دوو کەس.. لالە (کاکل) و وەستا (خدر) پێکەوە ئەو باسەیان گەرم کردبوو..

ـ کار وا بڕوات ئەم چاو قیچە هیچ ژن و کیژێکمان بۆ ناهێڵێتەوە، هەموویان لەڕێ دەردەکات!!

. تازووە با تەگبیرێکی خۆمان بکەین!!

. سا بابیرێکی قووڵی لێ بکەینەوە!!

ـ چۆن بیر بکەینەوە، چی ڕێگەیەك بگرین، هەموو ڕێگەیەکی لێ تەنیوینەتەوە!!

. تەنیا ڕێگەیەك هەیە، ئەویش ڕێگەی من و تۆیە!!

. من و تۆ بەتاك و تەنیا چیمان لەدەست دێت؟!!

. هەموو شتێك!

. دەسا دەستم با لەناو دەستت بێت!!

هەردووکیان دەستیان لەدەستی یەکدی ئاڵاندو بەرەو ناو گەڕەك غل بوونەوە!!

(٦)

ئەمپراتۆر فەرمانی دابوو، نابێت گەڕەکی خواروو تێکەڵ بەگەڕەکی لای ژووروو بێت، کۆڵانێکی تەنگەبەر لێکی دەکردنەوە، کە ژن و زاکان بۆ بازاڕی میوە فرۆشەکان دەچوون دەبوو تەماشای یەکدی نەکەن و، لەشۆستەکانیشدا بزەیەکیان بۆ یەکدی نەکەوێتە سەر لێو، تاوایان لێ هاتبوو ڕقیان لەخودی خۆیان دەبووەوە، بەڵام چی بکەن فەرمانی ئەمپراتۆرەو هەرکەسێك ملپێچی لێ بکات گیانی شیرینی خۆی لەسەر دادەنێت!!

ئێوارە لالە (کاکل) و وەستا (خدر) تەگبیرێکیان کردو بڕیاریان دا.. بچنە ماڵی لالۆ (سەرحەد)..

کە پێیان نایە ناو حەوشەکەی ماڵی لالە سەرحەد.. تومەز (سالە) گۆجی بێ کارەیش لەوێ دەبێت.. سالە گۆج

کوت و پڕ.. هەر بەو شەوە.. ئەمپراتۆری ئاگەدار کردەوە.. بۆ بەیانی بەدووی هەردوویدا نارد.. هەموو خەڵکی کۆکردەوە ڕەزیلی کردن، تف و نەفرەتی بۆ ڕەوانە کردن..

. تاکەی (............) دەمێننەوە؟!

. بۆ ئابڕووی بردوون؟!

. بیرتان نییە؟!

. پیاو نین؟!

هەموو پیاوان دەماری پیاوەتییان بزووت، لەناخیانەوە بوون بەیەك دەنگ، بەیەك زار، بەیەك گیان، ڕووبەڕووی کوێخا چاو قیچ بوونەوە..

ژنان هەموو پێکەوە دەدووان، پیاوان شەوان ئام و شۆی یەکدییان دەکرد.. دەنگ و باس بە ئەمپراتۆر گەیشت.. زۆری پێ ناخۆش بوو.. تا هات لاوازدەبوو.. دەیدایە دڵ.. تا ئەو نەخۆشە کەوت.. کە هیچ چارێکی نەبوو، ئەو ڕۆژە هەواڵیان هێنا..

ئەمپراتۆر نێوە خۆش.. ئەمپراتۆر مرد!! هیچ کەسێك بۆی نەگریا.. کەس ڕەشی لەبەر نەکرد!!

بەغدا ٣-١٢-١٩٨٨

# بەڕێوەبەر

(١)

نازانم ئاه و نزوولەی کێ بوو هاتە دی؟ ئاواتی کێ بوو چرۆی کرد؟ تکاو پاڕانەوەی کێ بوو بەردی هیوای تەقاندو ئەم بەڕێوەبەرە زاناو بەتوانایەی بۆ ناردین؟!

هەرچۆنێك بێت، بەختمان لەهاتدا بوو، بەخۆمانەوە نەمان دیتبوو، ڕاستیشتان دەوێت، ئەوەی بەخۆوەی نەدیتبێت وەکوو ئێمەی بەسەردێت، نازانێت ڕوو لەکوێ بکات، مژدەی ڕووداوێکی وای گرنگ بۆ چەند کەس ببات؟

ڕووداوەکە زۆر مەزنە، لەژیانماندا نەمان دیوە.. لەخۆمانەوە.. بەڕێوەبەری گشتی بۆ خۆمان هەڵبژێرین و.. پیاوی شیاو بۆ پلەو پایەی شیاو بهەنێرین..!! نا..نەو هەرگیز نەمان دیوەو نایبینین!!

(٢)

نامەخوا بەڕێوەبەری گشتیمان باسی قەڵافەت و ڕواڵەتی بێ وێنەو بێ ئەندازەی ناکرێت، تا بڵێیت باڵا چووە، تا بڵێیت سك ئەستوور بووە، بێ چاوانی بێت، چاویلکەکەی بۆ ئەوەندە جوانە، هەر لەخۆی دەکەوێت، ئەی جل و بەرگ و قاتە سپی و مۆرو شینەکان بۆ ناڵێیت کاڵا بۆ باڵا بڕاوەو بەرگدروو دانیشتووەو بۆ ویی دروست کردوون..!

ئەی جانتاکەی دەستی بۆ ناڵێیت دووا مۆدیلی (ئەسانسۆنایت).. بەترپەی پێیدا ناگات، یەکەمین چەشنەو

لەدووا فابریقەی ژاپۆنەوە هێنراوەو بەتایبەت لەوێوە بۆ ئەم کـڕراوە!! سـکی ئەسـتوورەو چـەندین نووسـین و وتـاری تێدایـە، خۆیشـی هـەڵی ناگرێـت، کابرایـەکی دامەزرانـدووە بـۆی هـەڵ دەگرێـت! مووچـەخۆرەکان! دەڵـێن، ئـەم بەڕێوەبەرەمان لەهەموو زانستێکدا، کەوچکێکی داوە، پەی بەهـەموو زانیارییـەك دەبـات، مێژوونووسـە، لێکۆڵـەرە، نووسـەرە، وتارنووسـە. سـەری لـەهۆنراوەو چـیرۆك و ڕەخنـەیش دەردەچـێت، سـەری بـۆ وتـاری جـوگرافی و گەردوونناسـی و مێـژوویش دەخورێـت!! بـا ئەوەیشـمان لەبیرنەچێت، کە خۆی گوتوویەتی: بەحزمایەتی بە (مامەند ئاغای هەمەقەندی) دەگات!!

باپیرەیشـی لـەبناری شوورەکانی (ئەربائیلۆ)ی دێرینـدا دژ بەداگیرکەران جەنگی توندوتیژی کردووە سەری چەندین سوارەی دەست بەنێزەو بەقەڵغانی پەڕاندووە!!

(٣)

لەیەکەمین ڕۆژەوە، کە بوو بەبەڕێوەبەری گشتی، هـەموو لێپرسراوو مووچەخۆرەکانی گرد کردەوە تیپی هەمەڕەنگی هێناو خاڵی هەمەجۆری بۆ دانـان، ئامۆژگاری و ڕێنـوێنیی باڵ دایـەوە، ڕێـڕەوو پـەیڕەوو پرۆگرامـی خـۆیی ڕاگەیانـد، گوتیشـی کـە دژ بەبیرۆکراتیـەت و ڕۆتینـە. دۆسـتی دیموکراتیەتـە، خـۆی مووچـەخۆران بەسـەر دەکاتـەوە، گیروگرفتیـان چارەسەر دەکات، پێویست ناکات بۆ بچووك تـرین تـەنگ و چـەڵەمە داوای چـاوپێکەوتنی بکـەن، خـۆی

بەژووری مووچەخۆراندا دەسووڕێتەوەو، سەریان لێ دەدات و تەنگ و چەڵەمەکانیان چارەسەر دەکات!!

ئەگەرچی مووچەخۆرەکان هیچ گیروگرفتێکیان نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت نەی دەبینین!!

(٤)

دەڵێن ئەم بەڕێوەبەرە حەزی لەمووچەخۆری ئافرەت نییە، سکرتێری پیاوی بۆ خۆ داناوە، کەچی ئەوانەی دەستەڕاست و دەستە چەپی ئافرەتن، دەستەڕاستەکانی ڕۆژی چەندین جار سەری لێ دەدەن، زۆرجار وای دەکرد، سپیلکە چاوشینە قژ زەردەکە بە سەعات و دووسەعات لەژووری بەڕێوەبەری گشتی نەدەهاتە دەرەوە، دۆسێکانی بۆ ڕێک دەخست، جارجاریش چاویلکەی بۆ دەسڕی و قۆڵنجی بۆ دەشێلاو بەپەرداخە ئاو دڵی فێنك دەکردەوەو، ئالۆشی لەشی دادەمرکاند!!

چی دەستەچەپیش هەبوون، چاوڕەشێکیان تێدابوو هەموو ئێوارەیەك سەری لێ دەدا، بۆئەوەی شوێن پێی نیازە زەردەکان لەتاریکاییدا ون بکات، ئەو چاوڕەشە کورتە بالاّ گەنم ڕەنگە کە سەری لێ دەدا سێ سەعاتی دەوامی ئێوارەی لەگەڵدا دەکوشت، کە دەهاتە دەرەوە، سەر لەنوێ مکیاژەکەی دەم و چاوی نوێ دەکردەوە، سووراوو سپیاوی دەداو دەتگوت نەئالۆشی وەراندووەو نەبای دیوەو نەبۆران!!

(٥)

گوتیان ئەم بەڕێوەبەرە گشتییە، ئەوەی باشە پشت بەڕاپۆرتی مووچەخۆرەکان نابەستێت، کەدرۆی تێدا بۆ هاوەڵە بەستەزمانەکانی خۆیان هەڵدەبەستن، گوتیان حەز لەدوو ڕوویی ناکات، گوتیان ئاگر بەهیوای سەوزی دڵی هیچ مووچەخۆرێکەوە نانێت، گوتیان حەزی لەمەلەکردنی نێو گۆمی قووڵ نییە!!

ڕۆژگار هەموو ئەمەی چەسپاند، سەگێکی ڕاگیرکردبوو، دەست و قاچی هەموو مووچەخۆرێکی بەدەمدا دەبرد، ئەمیش گۆشت و دووگی چەوری پێ دەدا، پەپکەی بەردەم دەخست، کەسی نەهێشت بەقەپاڵ و گاز برینداری نەکات!!

تا کار لەکار ترازا، برین لەناو برینداا.. زا!! قەپاڵێکی وای گرت، دەستێکی وای وەشاند، وەنەبوو سەری مووچەخۆرێکی برادەرمان بپەڕێنێت!!

(٦)

گوتیان بەڕێوەبەر ئاشنای کتێب و پەرتووکە، سەری لەناو کتێب و نووسیندا سپی کردووە، چاوی لەسەر دێڕو وشەی بچووکی کتێبە سک ئەستوورەکان دۆڕاندووەو ئێستا چاویلکەی کردووە!!

ڕۆژگار دەریخست، نووسەرێکی باشە، شێخ هۆمەر بۆی دەنووسێت، بەگوێرەی ئامۆژگاری ئەو وتار دەڕازێنێتەوەو، لاپەڕەی ڕۆژنامەکانی پێ پڕ دەکاتەوە، خۆ گۆڤارو ڕۆژنامەکانی نیشتمانی بێزارکردوون، ڕۆژ نییە بە وتارە بەنرخ و بەسوودەکانی بەسەریان نەکاتەوە، تاڕادەیەك

خوێنەر ئاشنای نووسینەکانی بوونەو ئەو نووسینەی لەهەر ڕۆژنامەو گۆڤارێکدا بڵاوبکرێتەوە.. لەبازاڕدا نۆرەی بۆ دەگرن و دەست ناکەون!!

تاڕادەیەك گیرفانی شێخ هۆمەری پڕ دەکرد، ئەوی قوڕبەسەریش هیچی بەهیچ نەکرد، تا لەژیاندا مابوو هەموو شەوێك بەدوو پێك سەری خۆی گەرم دەکردو دەگەڕایەوە کولانە ساردو سڕەکەی تا شەوێکی زستانی تۆف و پڕ باران و ڕەهێڵە، پاش سەر گەرم کردنەکەی کەوتە نێو زێرابێکی قووڵەوەو گیانی سپارد، بەیانی لەوپەڕی شارەوە دۆزرایەوە، بەپارچە کاغەزێك نەبووایە نەدەناسرایەوە!!

(٧)

هەندێکیان دەڵێن کتێب بەرهەم دەهێنێت، تا ئێستە دوو سێ کتێبی خستووەتە بازاڕاوە، ئەوەند دەخوێنێتەوە سەری لەهەموو زانستێك دەردەچێت، بەڵای خوایەو کەوتووەتە ئەم ناوەندەوە!!

ئەگەر بەدووی ڕاستیشدا دەگەڕێن، بامن پێتان بڵێم، ئەوا کتێبی (دەمانچەی نەتەقیو) کە سەبارەت بەهۆنراوەکانی (شێخ نەنوستوو)ە هی خۆیەتی، شێخ هۆمەر نەینووسیوەو گۆڤارو ڕۆژنامە کۆنەکان نەگەڕاوەو هۆنراوەکانی دەۆنەهێناوەو ئەو لێکۆڵینەوەیەی لەسەر نەنووسیوە، بەڕێوەبەری گشتی دەبێت کتێبی هەبێت، ئەمە قسەی یەکێك لەمووچەخۆرەکانە، کە (سەرکز خۆگێل کردوو)ەو بەگوێی بەڕێوەبەردا چووە، ئەویش بڕیاری داوە دەبێت کتێبی هەبێت، شێخ هۆمەری بەستەزمان ناچارە،

ناووبن باخەڵی دیارە، مشکەکان تلیلیی تێدا لێ دەدەن، گەر وا نەکات پێکێکیش نابێت سەری گەرم بکات!!

ئەگینا دیوتانە لەبواری هۆنراوەوە، بازبدرێتە بوواری مێژوو، تەنیا لای ئەم نەبێت، دەڵێن لەهەموو پیاڵەیەکدا کەوچکە!!

ئاگرێکە بۆ خۆی، شت نییە داوو دەرمانی لای وی پەیدا نەبێت!!

شێخ هۆمەری بەستەزمان بەرلەوەی بەو ڕووداوە دڵتەزێنە سەنگەری پێك و نووسین بەجێ بهێڵێت، کتێبی (مێژووی شۆڕشی زەردەواڵەکان)ی بۆ نەنووسی، ئەمیش بەچەندین وتار لەم گۆڤارو لەو گۆڤار لەو ڕۆژنامەدا بڵاوی نەدەکردەوە، بەتێپڕایتەری دەزگەیش نەنووسرایەوەو نەشبرایە چاپخانە، خۆی لەوێ بوو بەبووکێك، زاوا بەدەستی خۆی بۆ خۆیی ڕازاندبێتەوە!!

سەرتان سوڕنەمێنێت، بەڕێوەبەری گشتیی ئێمە، پیاوێکی چاکە چاریلکە لەچاو ناکات، چوار تەلەفۆن لای دەستی ڕاستی خۆیەوە دانانێت، دەست بەقژی کیژو ئافرەتە مووچەخۆرەکاندا ناهێنێت، لەدەوامدا بانگیان ناکاتە ژوورەکەی خۆیەوە، وادەیان پێ نادات، لەبازاڕدا سواری ئۆتۆمبیلی سووری خۆیان ناکات، لەئاستیاندا چاوی شەرم لەزەوی هەڵنابڕێت!!

لەجیاتیی سەگێك دووسەگی هارو دڕ ڕاگیر ناکات، کیژە جوانەکان.. شل و نەرمەکان.. ئەوانەی بۆن لەخۆ دەدەن..

خۆیان ڕێك و پێك دەڕازێننەوە.. سەرنجی لاوو پیر ڕادەکێشن.. لەنووسینگەی خۆیدا دانامەزرێنێت!!

بەڕێوەبەرەکەمان بێ وێنەیە، ئاوێنەیە، هیچ لەکەو پەڵەو تەڵخێکی پێوە نییە، ئەوەند بێ گەردە باسی ناکرێت!! بەناوو دەنگە، ووتار نووسە، مێژوونووسە، خەتی ئەوەند خۆشە ئەوەی شەشی سەرەتاییشی کۆتایی پێ هێنابێت، خەتی وا خۆش نییە، خەتی ئەم دەڵێیت شەڕە پشیلە نییە!! بڕوانامەی بەرزی هەیە، کەچی سێی ناوەندیشی نەبڕیوە!!

بەڕێوەبەری ئێمە ناوو دەنگی زۆر وڵاتان چووە، ئەمەی من باسم کرد یەکی لەسەدی کردەوە جوانەکانی نەبوون، خوا یار بێت نۆرەی ئەوانی دیکەیشی دێت..! بەڵام نامەوێت ئەم چیرۆکەتان لێرەدا بۆ بەجێ بهێڵم بێ ئەوەی کۆتایی پێ بهێنم، ئەگەرچی چیرۆکی ئێستەیش ئەوەند پێویست بەسەرەتاو لووتکەو هاتنە خوارەوە ناکات، گرنگ ناوەڕۆك و دەربڕینەکەیەتی!!

دوا دەنگ و باسی بەڕێوەبەر تەم و مژاوی نییە، ئەوەتا دوای شێخ هۆمەر، قالە کۆسەی نەدۆزیوەتەوە وتاری بۆ بنووسێت، ئەمیش بەرهەمێك کە بالەگچکەی برای نایبنووسێت لەگۆشەیەکی بڵاوکراوەی (بیابان)دا بڵاوناکاتەوە.. تا چەند قرووشێکی بۆ بنووسێت!!

ژوورەکەی خاتوو (فاتە)یشی بەرانبەر ژوورەکەی خۆی دانەناوە، تا بەتەلەفۆنێك بانگی بکات و نوێنێکی نەرمی بۆ ڕابخات و قۆڵنجی بۆ بشێلێت!!

نەك هەر ئەمە، نەشبووەتە پشیلەو مووچەخۆرەكانی نەكردوون بەمشك، تا قسەی ئەم و ئەوی یەكدی بۆ ببەن ، هەرچۆنێك بێت ئەمە دڵۆپێكە لەو دەریایە.. كە بێ گومان قووڵەو دوایی نایە!!

بەكەس باوەڕ مەكەن، كە گوتی بەڕێوەبەری ئێمە وایە، هەر كەس وابڵێت ناحەزە، دوژمنە، ڕق لەدڵە، دوژمنایەتیی لەگەڵدا هەیە، هەر ناحەزە وا دەڵێت، بەڕێوەبەری وا لەكوێ دەست دەكەوێت، لەئاو و رووبار

بدات قاپی پێی تەڕ نەبێت!!

بەغدا ١٤-٣-١٩٨٧

# نووسەر

زۆر کەرەستەو بابەتی وێژەیی و ڕۆشنبیری لەگۆڤارو ڕۆژنامەکانی نیشتماندا بڵاودەکەمەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا خۆم بەتەمبەڵ دەزانم و دەڵێم هیچم بە هیچ نەکردووە.زۆرجار بەخەیاڵی ئەوەوە بیرم دەبێتە دەمی تەڵەی تەقیو، چۆن بەرهەمی پتر بنووسم و چۆن پەنا ببەمە بەر پێنووسەکەم و قامچییەکی بەلاڕاندا بکێشم و بەناو جاڕو دێمەکاڵی بابەتدا بیرەتێنم. هەرکە هەلم بۆ برەخسێت لەژوورە کپەکەی خۆمدا ڕۆدەنێشم و دەست بەچنینی بیرۆکەی چیرۆکێك یان بابەتێك دەکەم..لەناکاودا بێ ئەوەی گەیشتبێتمە هیچ ئەنجامێك.. دەرگەم لەسەر لادەدرێت:

. بابە دوو پەنجاییم دەوێت بنێشت دەکڕم.

- کوڕم بڕۆ لەگیرفانەکەم دوو پەنجایی ببە.. ئاگەداری خۆت بە کە لەشەقام دەپەڕیتەوە، ئۆتۆمبیل لێت نەدات.

. بابەگیان دڵنیابە.

لەدووی خۆی دەرگە پێوەدەدات و منیش بەدیار ئەسپی سپین کردووی وشەوە دۆش دادەمێنم. هەرکە سەری جڵەوەکەیم بەردەست دەکەوێت ئەوەند دەزانم دەرگەم لەسەر دەکرێتەوە.. ئەم جارەیان کوڕە دوو ساڵانەکەم بەخۆی و داواکانیەوە بەژووردا دەکات:

. بابە.. ئۆتۆمبیل.

ئیدی دەست لەخامە بەردەدەم.. دەمەوێت بیانووی بپڕمەوە.. هەرچی دەکەم و دەکۆشم، هەر لەپەلپ و بیانووی خۆی ناکەوێت. ناو چەکمەجەی مێزەکەم دەپشکنێت.

ئەم گۆڤار هەڵدەگرێت و ئەو کتێب دەردەهێنێت و کاغەزو پێنووسی دەوێت و لەسەر مێزەکە چوار مەشقی لێی دادەنیشێت و لەجیاتیی من کاغەزەکان هێڵ و هێڵکاری دەکات و جاروباریش دەڵێت:

. بابەگیان جوانە. ئۆتۆمبیل جوانە.

ناتوانم لێی زیزبم و دڵی بشکێنم. تاقانەیەو زۆر خۆشەویستە. بۆیە پەلپ و بیانوو دەگرێت. زۆری خوو پێ داووم و بێ من دەرنابات. بگرە کە بمەوێت بۆ شوێنێك یان بۆ بازاڕ بڕۆم، ئەو پێشم دەکەوێت. منیش ڕیش بووەتە ڕیشمەوەو شانەم بۆ هەڵگرتووە.!

جاروباریش خۆی وەڕس دەبێت و بەئارەزووی خۆی بەجێم دەهێڵێت و دەرگەکەیش لەدووی خۆی پێوە دەدات. پەنا دەبەمەوە بەر ئەسپی وشە، ڕستە لەدوای ڕستە نزیکی مەبەست دەبمەوە..

لەپڕ یەکێك لەکیژەکانم خۆی بەژووردا دەکات:

. بابە غازم نەماوە.. دایکم دەڵێت: بچۆ غاز بهێنە.

یان:

. بابە بڕۆ نان بکرە.. ئەم ڕۆ هەینییە، لەبازاڕ نان دەست ناکەوێت..

فەرمانەو دەبێت ئەنجام بدرێت، خامەو کاغەز بەجێ دەهێڵم و دەڕۆم، غازمان بوێت..

غاز دەکڕم و دێمەوە، هەناسەبڕکێ پشووم لەبەر دەبڕێت.. کە دێشمەوە ئارەزووی نووسینم چۆلەکەیەکی تەڕەیەو بەرەو ئاسمان دەفڕێت.

ئەگەر نانیش بکڕم، دەبێت یەك چارەکە سەعات بەپێ بڕۆم تا دەگەمە نانەوا، لەوێش دە پازدە کەس نۆرەیان گرتووە، دەیانژمێرم دەکەس لەپێشمەوەن.. هەریەکەو پێنج خولۆك نۆرەیان بێت ئەوا نزیکەی کاتژمێرێك دەخایەنێت تا نۆرەم دێت. جیکڵدانم تەسك تەسك دەبێتەوە، هەزار جار نانەکەیان بەقوزەڵقورد دەکەم، کە دێمەوە زۆریان لێ تووڕە دەبم و مێشکم دەبێتە مریشکێك لەهێلکە چووبێتەوە هیچ گارە گار ناکات!

ماوەیەك پشت لەخامە دەکەم، سەرلەنوێ دەمەوێت دەست بەنووسین بکەمەوە، زڕە لەزەنگی دەرگەوە هەڵ دەستێت.

میوانەو خۆی بەژووردا دەکات:

ـ یاخوا بەخێر بێیت، ئەوە دیار نییت، ماوەیەکە سەرت لێ نەداوین.. ئەوە ڕێت ون کردووە.؟

ـ بژیت.. بژیت، بەخوا چی بڵێم کاروبارم زۆرن.. کەمێك نەخۆشم، گوتم سەرێکتان لێ بدەم، ئێوە لەشارن و شارەزاترن.. پزیشکی باش دەناسن. بەشکەم لەگەڵم بێن بچینە لای دکتۆرێك ئەم نەخۆشییەم چارە بکات.

لەدڵی خۆمدا ئەوەندەم ڕق لێ دەبێتەوە.. خوێنی لەکاسە بکەم تێری پێ ناخۆمەوە.

بزەم دێتێ و دەڵێم:

ـ ئەی بەسەرچاو، ئەگەر لەگەڵ تۆدا نەیەم، لەگەڵ کێ بڕۆم، کارێك بۆ تۆ نەبێت..

یاخوا هەرنەبێت!!

خۆم پۆشتە دەکەمەوە، بەجووتە بەرەو بازاڕی شارو شەقامی پزیشکان ڕێ دەگرینە بەر. تەماشای ناوی ئەم پزیشك و ئەو پزیشك دەکەین، کە لەسەر دەرگەی تیمارگەکانیان نووسراوە یان بەئەستوونەکانەوە هەڵواسراوە، دووسێ ڕیز دوکان بەجێ دەهێڵین، خۆمان بەژووری پزیشکێکدا دەکەین.. بلیت دەبڕین. ماوەیەکی زۆر دادەنیشین.

کە نۆرەی دێت لەگەڵی دەچمە ژووری پزیشکەوە.

نوژدار دەڵێت:

ـ ئەمە تا ئێستە لەکوێ بوویت؟ پێویستت بە (ئەشیعە)یە. بڕۆ (ئەشیعە) بگرەو وەرەوە.

دادەبەزین. بەدووی شوێنی (ئەشیعە) گرتندا دەگەڕێین تا دەیدۆزینەوە. ماوەیەکی دی کاتمان بەفیڕۆ دەچێت. تا (ئەشیعە) دەگرێت و دێینەوە لای دکتۆر، توورەییم چەقۆی خۆکوشتنم پێشکەش دەکات. بەڵام بیرم جڵەوی شێتی دەگرێت و ڕێی لێ دەتەنێتەوە.

نوژدار داوو دەرمانی بۆ دەستنیشان دەکات. ئەم جار بەدووی داوو دەرماندا، ئەم دەرمانخانەو ئەو دەرمانخانە دەگەڕێین.

لەشوێنێکی تەریکی بازاڕاوە دەرمانەکانمان دەست دەکەوێت و بەرەو ماڵ دەکشێینەوە.کاتی خزمەت کردن و نانخواردن دێتە پێشەوە. نان و خۆراك دەخورێت. چای بەدوودا دەکرێت.

دەمەتەقێ دەست پێ دەکات. نووسینەکەم لەولاوە چاوی زیتەی دێت و چاوم لێ دەقرپێنێت. بەلام دڵنیای دەکەم، هەرکە ئەو میوانە زۆر ئێسك سووکەم لەکۆڵ ببێتەوە، پڕی دەدەمێ و دەیگەیەنمە ئەنجام!!

کەچی تا ئەو نووسینە تەواو دەکەم، سەدان جار لەنووسین دەکرێم، تا بەئەنجامی دەگەیەنم. پڵتوکێکم لێ بدەیت گڕکانی ناخم دەتەقێتەوە!!

بۆیە دەڵێم خۆم بەتەمبەڵ دێتە بەرچاو، کە ئەمەم بۆ باس کردن، بۆتان ڕوون دەبێتەوە، تەمبەڵی لەمن نییە، ئەو بارودۆخە وای لێ کردووم خۆم بەتەمبەڵ بێتە بەرچاو!!

هەولێر ١٤ -١- ١٩٩٠

# مەرگەمووش

ئەگەرچی خانووەکەمان لەنێوان گەڕەکێکی کۆن و گەڕەکێکی نیمچە نوێدایە، کەچی تاڕادەیەک لەبواری پاک و تەمیزییەوە دڵگیرە، نەختێک لەوە بترازێت کە هەموو شتێکمان ئەم ڕۆ پاک بکەینەوە، سبەینێ قولانجێک تۆزیان لێ دەنیشێت، ناچار دەبین بە پەڕۆ.. بیانسڕین و لەبەردەم میوان و خزم و ناسیاودا شەرمەزار نەبین.. زۆر بێزاریش بووین کە خانووەکەمان سەرەڕێیەو نزیک بەبازاڕەو چی ناسیاوو خزمێک سەریان بەشاردا بتەقێت دەبێت سەرێکیش لەئێمە بدەن و تۆزێک دابنیشن و پلاوو گۆشتی مریشک سمێڵیان چەور بکات!

ئەم خانووەمان ئەوەی باشە لەمارو مێروو، لەمشک و رسق و جورجەوە دوورە، دارو درەختیشمان نییە.. لەبەرئەوەی خانووەکە سەری والایەو جێی باخچەیشی نییە، باڵندەو مەل لێی بنیشنەوەو، گیانلەبەرێدیکە بەخۆوە بگرێت و ببێتە جێی زیان و نیگەرانی.. زۆریشمان میوان دێت.. ئەگەر بڵێم زەنگی دەرگەکەمان ڕۆژی سەد جار زرەی لێوە دێت تۆ بڵێ دووسەد!

ئەوە لەلایەن رسق و جورجەوە، هەر لەم ناوە نەبینراون، ئەو دوو سێ مشکەیش دەچوونە مووبەقەکەمانەوە لەکونی ناوەڕۆی جۆگەڵەکەوە.. لەکۆڵانەوە هاتبوونە ژوورەوە.. بۆنی ڕۆن و گۆشتی چەوریان کردبوو، ئەوەی باش بوو

تەڵەیـەکی کۆنمـان هـەبوو هەرسێی پێوەبـوون و سـەرمان ئاسوودە بوو!

ئـەو ڕۆژە گەیشـتمەوە، جارێـك جلـەکانم نـەگۆڕیبوو ژنەکەم هەواڵێکی ناخۆشی پێ دام، گوتی:

- پیاوەکە زانیوتە جورج لایەك لەعەباکەی خواردووم!

گوتم:

- نەڵێیت! عابا نوێیەکەت؟

- بەڵێ، بەکەڵکی ئەوە نەماوە بەسەریدا بدەم!

- ماڵی جورج بەقوڕ بگیرێت.. ئەو عابایـەی بەبیسـت و پێنج دینارت کڕیبوو..

مووچەکەیشـم دەری ناهێنێـت.. تـا عابایـەکی نوێـت بـۆ بکڕم، باشە ئەو جورجە لەکوێوە هات؟!

- وابـزانم ئـەو ڕۆژە دەرگـەی دەرەوە لەسـەر پشـت بـوو کاتێـك میوانمـان هـات. ئـا ئـەو کاتـە گیانلەبـەرێکم بینـی لەدەرەوە تیژ تێپەڕی و هاتە ژوورەوە، لەوانەیە ئەوە جـورج بێت و ئەو لایەکی عەباکەی خواردبێ.

لـەو ڕۆژەوە خـەو لەچـاومان نەچـوو، پـلان و ڕێ و شوێنمان بۆ لەناوبردنی ئەو جورجە دانا. دایکی منداڵەکان ئـەو دەرمانـە شرێسـینەی هێنـاو، کارتۆنێکی ڕۆخسـت و دەرمانەکەی لەسەر ڕۆکردو، لەپشتی کەنتۆرەکەوە داینا.

شەو هات و جورج دەستی بەخرەخڕ کردو خەوی لەچاو حەرام کردین. هەڵسام پێ لەقەیەکم بەکەنتۆرەکەدا کێشا، تاماوەیەك دەنگ نەما.. خەو چوو بووە چاوم و نەچووبوو، خێزانەکەم بەدەنگی نزمەوە هاواری لێ هەڵسا:

- ئەوەتـە.. ئەوەتـە، لەسـەر مێزەكەيـە، جـورجێكی گەورەيە..

ڕاپـەڕيم.. لەهەڵسانی منـدا نـەزانرا بـەرەو كـوێ چـوو.. هـەر نەبوو بۆ تۆزێك خەو چاوەكانم لەكەللەی سەرمەوە دەرپۆقنە دەرەوە، ديسـانەوە ڕاكشـامە سـەرجێ، نـەمزانی كـەی ڕۆژ بووەوە.

بەيانی كە هەڵساين هەموو نوێنـەكانمان لەسـەر بۆفيەكـە لادا، تۆمەز لێفەو دۆشەك و سەرينی بۆ نەهێشتووين ناچار هەموومان لەژوورەكەی دی لەسووچێكەوە هەڵپەسارد.

كێشـەكە گـەورەتربوو، خـزم و ناسـيارو دراوسـێكان پێيـانزانی. يـەكێك گـوتی: تەڵـەی گـەورە بهێـنن. ئێمـەيش ناچار بووين بير بكەينەوە چۆن ئەم جورجە لەناو ببەين و نـەهێڵين زيـانی زۆرترمـان لێ بـدات. ئـەم جـارە خێزانەكـەم چـووە بـازاڕ مەرگەمووشـی كـڕی و، لـەنێوان كـەنتۆرو ديوارەكەدا ڕۆی كرد.

پێم گوت:

ـ ئـافرەت نەكـەيت بـير لەمنداڵـەكان ببڕيـت تۆزێـك لەمەرگەمووشـەكە بخـۆن و وابـزانن شـتێكە دەخورێـت و لەسەر ڕيش سمێڵيش دابنێين..!

مەرگەمووشـيش سـوودی نـەبوو. لـەبازاڕ تەڵەيـەكی گـەورەمان بەسـێ دينـار كـڕی پـەنيری چـەورو پەپكـە چەورەمان پێـوە لكانـدو لەپشـتی كەنتۆرەكـەوە دامـان نـا، بەشكەم مام جورج سەری لێ بدات و پێوەی ببێت و ژيانی پێ كۆتايی بێت ، كەچی هيچ ئاواتێكمان بەدی نەهات. تا

کتێب و دەفتەرو کەل و پەل وەستابا، مام جورج بەنزیکی پەنیری تەڵەو پەپکە چەورەو مەرگەمووشدا نەدەهات!

کار لەکار ترازا، جورجەکە لەپشتی کەنتۆرەوە سەنگەری خۆی قایم کردبوو، ڕۆژان دیار نەبوو، شەوان دەردەکەوت و دەکەوتە خڕەخڕو شت و مەکی دەکرماندو خەوی لێ حەرام دەکردین!

هەفتەیەك پتر بەو پەرێشانییەوە تلاینەوە، سەر لەبەیانییەك خۆم پۆشتە کردبووەوە، دەمویست لەماڵ دەربچم، ئەوەندە ماندوو ببووم، شەو خەوم لێ نەکەوتبوو هەستم بەجم و جووڵی جورجەکە نەکردبوو، پرسیم:

. ئەرێ ئافرەت دەڵێیت جورجەکە نەماوە، ڕۆیشتووە.

– ڕۆیشتنی چی! ئەم شەو لای سەرمانەوە خڕەی دەهات. لەوانەیە لەم سووچەوە بێت.

پەنجەی بۆ سووچەکە ڕاکێشا. ئەو سووچەیش ئاسقییەکەی لێ بوو. شتەکانی سەر ئاسقییەکەمان لاداو ڕامانکێشایە ئەم لاوە. لەسەر ئاسقییەکە ڕووانیم پیرە جورج لەنێوان دوو دیوارو کەنتۆرو ئاسقیدا گیری خواردووە. دارێکم بەدەستەوە بوو. پێمداکێشا. دەیویست بەکەنتۆرو دیوارەکەدا هەڵبزنێت. بەڵام من ڕێم لێ گرتبوو. داوای دارێکی درێژم کرد. کە دارەدرێژەکە گەیشت. دارێکی توندم پێدا کێشا..

لەجووڵە کەوت. پاشان بەتەواوەتی ئاسقییەکەم لاداو بەدارەکە فڕێمدایە دەرەوە..! تەماشای پشتی کەنتۆرەکەمان کرد بەرگی کتێبێکی بەتەواوی خواردبوو،

بەڵام کە ویستبووی ناوەرۆکی کتێبەکە بخوات.. کۆتاییمان بەژیانی نەگریسانەی هێناو بەم شەودا بێ پەژارەو نیگەرانی نوێنەکانمان گێڕایەوە شوێنی جارانی خۆیان و ناو ژوورەکەمان ڕێك و پێك کردەوەو دڵنیا سەرخەوێکی باشمان شکاند!!

هەولێر ٣-٢-١٩٩٠

# دوو کورتیلە چیرۆك

## (١)

## نان

ژ مێــژ نییــە بــاوکی نــەخۆش کــەوتووە، لەماڵــەوە درێژبووەتــەوە، ئــەو دەرمانانــەی پێــی دەدەن، تەندروســتیی چاك ناکەنەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا دەرامەتێکی دیکـەیان نییـە پشتی پێ ببەستن.

ئەو ڕۆژە باوکی نەخۆش و برسیش بوو، نانەڕەقەشـیان لەماڵدا نەبوو، کوڕەکە هەڵساو، لەماڵ چووە دەرەوە. ڕووی کردە ڕیزە بازاڕێکی ئەو لایان، دەستی پاڕانـەوەی لـە ئـەم و ئەو پان کردەوە، بیری هەر لەلای نزرە نزری باوکی بوو کە هەناسەی سوار ببوو!!

پەلـەی کـرد، بـایی چـەند نانێـك پـارەی دەرۆزە کـرد، لــەنزیکترین نانەواخانــە لای دا، دیتــی دوو ســێ کــەس لەپێشــیەوەن، تــا نــۆرەی گەیشــتێ ماوەیــەکی خایانــد، نانەکانی وەرگرت و ژماردنی و بەپەلە تێی تەقاند..

بیری لـەوە دەکردەوە.. ئێسـتە دەگاتـە مـاڵ و مژدەیـەکی خــۆش بـە بـاوکی دەدات.. نــانی بــۆ هێناوە..دەگاتــە بــەر دەرگــەی مــاڵ و دەچــێتە نــاو حەوشــەوە..قەرەباڵغییەکی نائاســایی نیشــانەی سەرســوڕمانی لەبەردەمــدا دروســت دەکات.. پڕ دەداتە ئەو ژوورەی کە باوکی تێدایـە..دەبینێت تــەرمی بــاوکی بــەجاجمێك داپۆشــراوە.. لەپڕمــەی گریــان دەدات و ئەم ڕستەیە لەگوێیدا دەزرنگێتەوە:

. لەبرساندا مرد!! لە برساندا مرد!

(٢)

## دەستریَژ

بەپەلـەبوو، لـەناو بـازاڕاوە بـۆی تێتەقانـد، تـازە لەقوتابخانـەوە هـاتبووە نێـو بـازاڕ، بـیری لای ماڵـەوە بـوو، شەقامە درێژە پڕ لەدرەختە بەرزەکانی تێپەڕاند، کیسەیەکی نـایلۆنی ڕەشـی بەدەسـتەوە بـوو، هـەتاو ماڵئـاوایی لەئاسـۆ دەکـرد، هـەنگاوی خێـرا خێـرای دەهاویشـت، لـەترافیك لایتەکـە ئـاووڕی دایـەوە، چـاوی لـەفێرخوازەکان بـوو پەرتووکـەکانیان بـەبن دەسـتانەوە بـوو بـەرەو ماڵـەوە ملیـان دەنا ئەمیش گلۆپی بیری بەلای منداڵەکانیدا داگیرسا.

هاتـەوە هۆشـی نێـو شـەقامەکەی تێیـدا بـوو، دوو پیـاوی دەم و لـووت پێچـراوی چەك بەشـانی لـەدوو بـوون، گولـۆپی سـەوز پێبـوو، هـەنگاوی لێ هـەڵهێناو ویسـتی بپەڕێتـەوە، لەپشتەوە دەنگێك تێی خوڕی:

. کوڕە نەڕۆیت!

ئاوڕێکی لەرزۆکانەی دایەوە، هەنگاوەکانی تیژتر کردن، گـوێی نەدایـەو ڕاسـت ڕۆیشـت، ئەوەنـدەی گـوێ لێ بـوو دەسـتڕێژێکی لێ کـرا، بـەربووەوە سەرشۆسـتەکە، خڵتـانی خوێن بوو. گەیشـتنە سـەری و، پڕیـان دایـە کیسـە نایلۆنـە ڕەشەکەی دەستی و ڕایان ڕفاندو بزربوون.

لەسـێبەری تاریکییەکـدا ڕۆنیشـتن، بەتـەمای ملیۆنێـك دینـاربوون، کیسـەکەیان پشـکنی، دەفتـەری ئـەزمونی فێرخوازەکانی تێدا بوو! تـا دەسـتیان بگرێـت تووڕەیـان داو ڕۆیشتن نێچیرێکی دی دەست بخەن!!

هەولێر ٢٨-١-١٩٩٤

# کورسی!

فەرمانی بۆ دەرچوو پێش ئەویش یارمەتیدەر پێوەندیی پێوە کردو لەگەڵی ئاخفت و پێی ڕاگەیاند:

. ئەو پلەو پایەم بۆ تۆ هەڵبژاردووە.

بەتاقیکردنەوەو هەڵس و کەوت بۆی دەرکەوتبوو کە دەتوانێت ئەرکەکە ڕاپەڕێنێت، بۆ..نا.. ئەوە چەند ساڵە لەهەمان ئەو شوێنەدا ئیش دەکات و، بەتەواوەتی شارەزای تواناو لێهاتوویی بووە، ئەمیش هیچ خۆی نەشڵەژاند، وەڵامی ئەوەبوو:

. هەرشتێکم پێ ڕابسپێرن ناڵێم نا..

کارەکەی ئەنجام دەداو بێ پشوودان ڕایدەپاڕاند!!

بۆ بەیانی بەپێپلکانەکاندا سەردەکەوت، هێشتاکە دەرگەی ژوورەکەی نەکردبووەوە، مامۆستا (دلێر) لەبەردەمیدا قوت بووەوە، مەچەکی توند گرت و بەرەو ژوورەکەی خۆیی برد، خۆی لێی دانیشت و ، ئەم بەپێوەو، بەدەم دانیشتنەوە چەند کاغەزو نووسراوی دایە دەست و لەگەڵیاندا گوتی:

– ئاگەت لەمانە بێت.. دەبێت زوو چاو هەڵبهێنن!! دۆست و خاوەندەکانیان پێوەندییان پێوە کردووم، دەبێت دەست و برد بکەیت!!

ئەم هەر سەری بۆ دەلەقاندو، بەهەزارو یەك بیانوو خۆیی لەدەست ڕزگارکرد، کە لەژوورەکەی خۆی جێگیر بوو.. ئەوەندەی زانی بوو بە شارە مێروولەو.. چەندان ناسیاوو نەناسیاو تەنگیان پێ هەڵچنی.. ئەوی سەرقاڵیش دەبوو کارەکانی ئەنجام بدات و بۆ شوێنەکەی دی بگەڕێتەوە..!

ئەم نووسراوەی دەدایە.. ئەوی دی هەواڵی نووسراوێکی پێراری لێ دەپرسی.. ئەوەکەی دی گلەیی و گازاندەی لەدوواکەوتنی چاو هەڵهێنانی نووسینەکەی دەکرد.. ئیدی کابرایان وڕو کاس کرد.. نەیدەزانی چۆن دەم بکاتەوە..جار ناجاریش لەگەڵ دۆزینەوەی وەڵامی ڕاست و ڕووندا.. دەمی دەبوو بەتەڵەی تەقیوو، چاوی ئەبڵەق دەبوون، مێشکی لەکار دەکەوت!!

شتێکی سەیریش گوزەرانی ئەو ڕۆژانەی لێ تاڵ کردبوو، سەرەڕای سەرقاڵی و کەم کاتی!!.. نەیدەتوانی لێرە بۆ ئەوێ بجووڵێتەوە، لەناو ژووردا، لەبەر دەرگەدا، لەئۆتۆمبیلدا، لەناو ڕێڕەودا، لەکاتی دابەزین بەپێپلکەو، لەهەر شوێنێکدا بووایە..هەر خەڵك بوون بە ڕووخۆشی و پێکەنین و بزە بەسەرلێوەوە تاویان دەدایەو تەوقەیان لەگەڵ دەکرد..

. هەر لەخۆت دەوەشێتەوە!

. پیاوی شیاو.. لەشوێنی شیاودا!

. ئەو شوێنە هەر شایەنی تۆیە!

زرەی تەلـــەفۆنیش لـــەولاوە ڕابووەســـتێت، یـــەکێك پیرۆزبایی دەکرد.. یەکێك گلەیی دەکرد..

ـ کـاکی بـرا خـۆت شـاردووەتەوە، بـا چـاومان پێـت بکەوێت.. هەر نەبێت تاوێك دانیشین..دوو قوم هەڵدەین و چوار قسەی لێ بکەین..!

. من هەر گوتوومە تۆ شایەنی ئەو شوێنەیت.. شوێنی دەست ڕەنگینیشت دیارە.. ئەوە نییە.. تەماشاکە.. بەخوا لەهەموو لایەك هەر باسم کردوویت!! دە.. دیار بە.. دیار!!

نەیـدەتووانی بـەبازاڕدا تـێ بپـەڕێت.. هـەر ناسـیاوو نەناسیاو بوون.. مەچەکیان دەگرت:

ـ بەخوا ئەم شەو دەچین لەیانەی (..........) نەختێك سەری خۆمان گەرم دەکەین..!

ئـەویش بـە هـەزاران بیـانوو.. بەهـەزاران سـوێندو پاڕانـەوەو تکـاو بەڵێن.. خـۆی لێ ڕزگـار دەکـردن .. بستێك دەچـوو.. یـەکێکی دی لـەولاتر تـەنگی پـێ هەڵدەچـنی.. هـەمان داخـوازیی بەگوێـدا دەدا!! هەڵچـوونی دەگەیشـتە ترۆپك.. بەپاڕانەوە خۆی لەئەویش ڕزگار دەکرد!!

ماوەیەك بەو جۆرە ژیانی کەوتە بەر شاڵاوی مەترسیی سـەرقاڵی و تەلـەفۆن بـۆ کـردن و سـۆراخ پرسـین و لـەدوو گـەڕان، کـە ئەرکەکـەی خـۆی بەسـەرکەوتوویی ڕادەپەڕاند.. تاڕادەیـەك یارمەتیـدەر زۆری پـێ خـۆش بوو! ئەو وشـانەی لەزار ترازابوون:

. لەزووەوە چاووم بڕیبوویە !

لەم لاوە ئەم هەر سکاڵاو ئاخ و ئۆفی لەدەستی ئەو ئەرکە دەردەبڕی، حەزی لەو شوێن و پایەیە نەبوو.. لێوی لێ هەڵدەقورتاند.. زۆرجاریش لەبەردەم بڕادەران و ناسیاواندا دووبارەو سێ بارەی دەکردەوە:

ــ ئەو شوێنەم ناوێت.. نامەوێت.. لەوێ دانانیشم..نا..نا!!

وەڕسی نەیگرتبوو، ڕێگەی داهێنان و ئازادیی بیرکردنەوەی لێ تەنیبووەوە!! ئەویش حەزی بەئازادیی بیرکردنەوەو داهێنان و خوێندنەوەو خۆ خەریککردن بە وشەوە بوو..

سەر لەبەیانییەك یارمەتیدەر.. بەدوویدا نارد:

ـ تۆ ناڵێیت لەو ژوورەدا دانانیشم.. ئەو شوێنەم پێ ناخۆشە..! ئەویش بەزەردەخەنەیەکەوە، وەك بڵێیت چۆلەکەیەکە دوو باڵی ئازادبوونی لێ ڕوواوە گوتی:

ـ بەڵێ گوتوومە.. پێی لێ دەنێم!

یارمەتیدەر لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی:

ـ بۆیە بڕیارمان داوە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێت و.. لەژوورەکەی دی دابنیشیت..

کلیلەکەیش بە (دڵدار) بدە.. ئەو لەو شوێنە دادەنیشێت!!

گێتییەك شادی و کامەرانی خۆی هاویشتە نێو دەروونیەوە.. چوون پاساری تازە فێری باڵەفڕێ بووبێت.. فڕی.. فڕی.. ئیدی خەڵکەکە کە بینییان وای لێ هات..

دوێنێ وەك نیسك ڕوویان تێ دەكرد.. بۆی پێ دەكەنین.. لەدووی دەگەڕان.. پێوەندییان پێوە دەكرد.. سۆراخیان دەكرد.. بانگهێشتیان دەكرد.. هەردوو ڕووەكەی خۆیان ڤەشێردو چاویان نوقاندو ڕۆیشتن!!

ئەمیش لەشوێنەكە مۆڕ بووەوە.. بۆی بكرایە دەیسووتاند!

هەموو تاوانەكە تاوانی شوێنەكە بوو.. ئەو خەڵكەی وا لێ كرد. بۆیە دروشمێكی بۆ خۆی هەڵبژارد.. تا لەژیاندا مابێت توخنی كورسی.. توخنی شوێنی لەو جۆرە نەكەوێت!!

٢٨ -٣-١٩٨٨

# دانپێدانان

لەیادمــە هــاوینێکی هەشــت ســاڵ لەمــەوپێش بــوو، دانەرەکەم، بەداخوازییەکی نووسراوەوە لەبەردەستی چاپ و بڵاوکردنەوەداه داینام، بەرپرس ئەم دیوو ئەو دیوی کردم و بەڵێنی دا:

- بەسەرچاو، تۆو ئەمە، خوا یاربێت، بەزووترین کات رووناکی دەبینێت!

لــەناو لیســـتی دەستنووســـەکاندا ژمــارە ســـێزدەم بەرکـەوتبوو، نووسـەرەکەم هــەر ئـارەزووی لـەژمارە سـێزدە نییە، ئیدی لەودەمەوە ئەم رێکەوتەی بەرەشبینی زانی و تا دەهات چاوی هەر دەرفی!!

ژمارەکانی پێش من یەک لەدووی یەک بەرەو چاپخانە رەوانە کران و، بە بەرگی رەنگاورەنگ و سەرنج راکێشەوە رووناکییـان بینـی و، بوونـە بنێشـتە خۆشـەی ژێـر ددانـی رەخنەگرو نووسەرو خوێنـەران و، لەسـەر مێـزی مەیخانـە، لەگــەڵ مــەزەی جۆربــەجۆردا، بوونــە مــەزەی رەخنــەو رەخنەکاری و چاویان لێ زیت کرایەوەو، لەچاپخانەکاندا، لەگەڵ چای دش و تاڵ و شیریندا، ئەوەند باسیان لێوەکرا تلپـی تـەرو وشـکیان تێدا نەهێڵرایـەوە. منـیش شوێنەکەم گـەزم بـوو، لـەئامێزی دۆلابێکـی ئاسـنیندا تاسـێنرابووم،

سەرمابردەی زستان ئیرەیی پێ دەبردم، کەس ئاوڕی لێ نەدەدامەوە.

نووسەرەکەیشم، نەماست و نەنانی تیری و نە شەڵتانە سێوو، نە کارتۆنە مۆزی هەبوو، دەمی ئەم و ئەوی پێ چەور بکات و لەژمارە سێزدە ڕزگارم بێت و تیشکی ڕووناکیم بەر بکەوێت و، ببمە شووتییە سوورەی بەردەستی لێزانان و هەر ڕەخنەگرو ڕەخنەنووسێك بمداتە بەرسیکاردی لێکۆڵینەوەو لێ وردبوونەوە.

بەم جۆرە تەماشام دەکرد ژمارەکانی ڕەشنووسەکان لەپێش و لەپاشی منەوە، هەرچی دەهات، ئەوەندەی نەدەخایاند بەنووسراوەوە، بەرەو چاپخانە ڕەوانە دەکراو، غلۆر دەبووەوە، بەڕازاوەترین ناونیشان و بەرگەوە، دیدەی بخوێنانی نیشتمانیان ڕووناك دەکردەوەو، منیش لەناو (قیر)دا گیرم خواردبوو دوو سێ عەرەبانەو ئەسپ و پیاوی ڕیش سپی دەیانتوانی زۆر بەئاسانی دەرم بهێنن، بەڵام ئاخ لەدەستی ئاخی نەداری، نووسەرەکەم کڵاش چەك بوو، ڕۆژگاری گیرفانی تەنگ بوو، دەستیشی نەدەگەیشتە سەرووی دارخورماکان!!

لەژمارە سێزدەدا چەقیم، ژمارە پەنجاو شەستیش گەیشتنە بازاڕی چاپەمەنی و، پاش ئەوانیش چەندانی دیکە بەشارەزاو پسپۆڕان دران بخوێنرێنەوەو، بڕیاریان لەسەر بدرێت، ئاووڕیش لەمن نەدرایەوەو لەناو دۆسێیە پەڕپووتەکەیان دەرنەهێنام، بەم جۆرە چوار ساڵ لەناو

دۆڵابێکی تاریکدا فڕێ درام، تیشکی هەوایەك لێی نەدام، لەپڕ پاش ئەو هەزارو چوارسەد شەست و یەك ڕۆژە، دەستیان برد لەدۆڵابی تاریکیان دەرهێنام و، ڕۆژێك بەدوای نووسەرەکەیاندا ناردم و، نووسراوێکیان پێ مۆر کردو، تووڕیان دام.

- بیبەوە، بواری بڵاوکردنەوەو چاپمان نەماوە!!

دانەرەکەم، هیواو ئاواتی شکستی هێنا، هەڵسا ڕووی کردە دەزگەیەکی دی. پێش چەند ساڵێك بەرهەمێکی دیکەی بۆ چاپ و بڵاوکردبووەوە، خوا هەڵناگرێت پێشوازییان لێکرد، بەڕوویەکی گەشەوە وەریانگرتم. هەر ئەو وەرگرتنە بوو. نەمزانی لە چ شوێنێکدا بوو شاردیانمەوە، کۆبوونەوە دوای کۆبوونەوە کرا، ناوی من هەر نەبرا، دووساڵ قووتم خواردەوە، هەرکە دانەرەکەم بیپرسیایە، بە ڕستەیەکی کورت وەڵامی دەدرایەوە:

- نۆرەی دێت، نۆرەی دێت!

نۆرەی چی! تا خاوەندی نانی تیری و ماست و پەنیرو مۆزو سندووقە سێوەکان وەستابان، من لە هیچ شوێنێك نەدەبینرام!!

لێرەیش نزیکەی هەزار ڕۆژێك بێ سۆراخ مامەوە، دانەرەکەم دۆستێکی ڕاسپارد، بەرپرسەکە گوتبووی:

- هێشتە یەك ساڵ بەسەر بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەی پێشوویدا تێ نەپەڕیوە!!

کاتێك ئەم ڕستەیەی بەرگوێ کەوتبوو، دەمی بوو بووە تەڵەی تەقیو، چاوی ئەبلەق بوو بوو، لێپرسراوی کۆن چوو، لێپرسراوی نوێی لەشوێن دانرا. دانەرەکەم یادداشتێکی نووسی.

ئەوەندەی نەبرد لەناو کەنتۆڕێك ڕەشنووس و دەستنووسدا دەریانهێنام و، بەنووسراوێکەوە بە شارەزایەکیان دام، شارەزا خوێندبوومیەوەو بەگوێرەی دڵی وی بووم، لەبەدبەختی و چارەڕەشی دانەرەکەم ، شارەزا لەو شارە باری دەکرد، تا ڕۆژێکیان بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە ماڵیان پێچرابووەوە، منیشیان لەگەڵ رەوە کتێبەکانی خاوەن ماڵدا لەکارتۆنێك پەستابوو، ماوەی سێ مانگی ڕەبەق لەناو پیرە کارتۆندا دەست بەسەرو بەندبووم.

کاتێکیش شارەزا سۆراخی خواردم و بەدەزگەی دامەوە، ماوەی ئەوە نەمابوو چاوی کاڵ لەچاپخانە هەڵبهێنم، لەم ئاقارەدا گیرم خواردبوو، چەند کۆبوونەوەیەکی دیکەیش کران، کەسێك نەبوو هەر بۆ ناو، ناوی من بهێنێت، ئێستە لێرەیش چوار ساڵی ڕەبەقم بەسەربردووە، ئەوەبوو بەهەشت ساڵ، خاوەنەکەم سەری خۆی لەدارو بەرد دەدات، هیچ بەهیچ ناکات، منیش منداڵێکی تەمەن هەشت ساڵانم، هەشت ساڵە دەمەوێت لەدایك ببم، فێری گڕوگاڵ و گاگۆڵکێ ببم، ببمە بزەی سەر لێوی بخوێنان، کەچی هێشتە هەر سەرکوت دەکرێم و، چاوی گەشم بۆ ژیان هەڵنەهێناوە!

پێی لێ دەنێم و دەڵێم ئەگەر نووسەرەکەم لەژمارە سێزدە ڕەشبین نەبووایەو کەمێك هەنگوین و ماست و پەنیرو نانی تیری و هێشووە مۆزی ببردایە، سمێڵی ئەم و ئەوی چەور بکردایە، بەشان باهۆوی ئەم و ئەویدا هەڵبدایە، ئەوکات منیش لەناو نووسراوەکاندا بزەی سمێلم دەهات و دەبوومە بابەتی دەمەتەقێی سەر مێزی مەیخانەو چاخانەکان و، هەر نەبووایە پێشکەش بەچەند نووسەرێك دەکرام، کە بڕێکیان لەدەوری قەلاتدا دەیانفرۆشتمەوە!.

هەولێر ١١-٧-١٩٩٠

# ئاپوورەو لافاو

لەناو چەقی شاردا ئاپوورەی ڕێبوار شارەزەردەواڵە بوو، شۆستەکانی ئەم بەرو ئەوبەر بە وردەفرۆش و، شەقامەکانیش بەگالیسکەی میوە فرۆش و شەکرو برنج و شیرینی و سەوزەو خورماو بیبسی و پەتاتە فرۆش تەنرابوونەوە، شۆستەکەی ئەو بەرەوەیش بڕێک منداڵی ڕۆژنامەفرۆش دەواری گۆڤارو ڕۆژنامەکانی خۆیان لێ هەڵدابوو، ئاپوورەیەك دەوری لێ دابوون، مانشێتە جۆراوجۆرەکان زمانی هەواڵێکی ساختەیان لێ دەردەهێنان. ئەو لاتریش شیرفرۆش و پارە گۆڕەرەوەو پینە دۆزەکان، لەمێژبوو بۆ خۆیانیان تاپۆ کردبوو، پۆلیسی هاتووچۆیش لەولاوە زەقەی چاوی دەهات و، ڕێبوار گالیسکە ڕێیان بە ئوترە جۆراوجۆرەکان نەدەدا، تەنانەت شاوریش لێ بدەن، شاوری پۆلیسەکانیش شەرم دایگرتبوون، ترەفیك لایتەکان مانیان گرتبوو، یاسای هات و چۆش خۆی لەسێدارە دابوو! پاڵەوانەکە پەلەی بوو، دەیویست بگاتە گەڕەکی خۆیان و، کارەکانی ئەنجام بدات، هەندێك گۆڤارو کتێبی هەمەڕەنگی لەبن هەنگلدا بوو، نەیدەزانی کامیان بەر چەقۆی خوێندنەوە بدات، ئاپوورەکان ڕێیان لێ تەنیبووەوە، دەرزیت

هەڵدابا بەر سەریش نەدەکەوت، منداڵە وردکەکان بەئاسمانی کاتەوە دەیانقۆستەوە.

پاڵەوانەکە بێزاربوو، ئەم ئاپوورە یاخی بووەی لەلا ببووە تەگەرەو کۆسپێکی بەردەم یاساو نەریتی شارستانی، ئەوەتە هەموو جارێك یاسا دەست دەداتە تفەنگ و شمشێرو نێزەو، بەگوللەی بڕگەکانی خۆی ئەم سەنگەرەیان لێ وەردەگرێتەوەو، چەقی ڕێگەو شۆستەکانیش شایی و بەزمی هەڵپەڕکێی خۆیان لێ ساز دەدەن و، حەوت ڕۆژو حەوت شەو زەماوەند ساز دەدەن و گۆرانی و لاژە دەچڕن، کەچی لەچاوترووکانێکدا هەرکە پۆلیسەکان دڕیان بە تاریکایی شەو داو لەودیوی ترەفیك لایتەکانەوە بزربوون، گالیسکەو وردەفرۆش و ئیکسپایەرفرۆش ناوچەقی ڕێگەو شۆستەکان دەتەننەوەو، گوڵەبەڕۆژەی بەندی یاساکان دەترووکێنن و، بگرە توێکڵەکانیشیان قووت دەدەن!

ئۆتۆمبیلێك پێش پاڵەوانەکە، سنگی نابووە بەر شەپۆلی ئاپوورەی ڕێبواران و، گالیسکەکان، زۆر دژوارو، هێدی هێدی، سەوڵی بەرەو پێشەوەی دەهاویشت، شوفێرەکەی کەمانچەی توورەیی دەژەنی، ئەمیش دەروونی سیخناخ پڕ لەجنێو ببوو، جنێوەکان دەڕژانە سەر شۆستەی پڕ لەئاپوورەو چەقی ڕێگە پڕ لەگالیسکەو وردە فرۆش و ڕێبوارەکان، بەدەم و چاویاندا دەهاتە خوارێ و، ختووکەیان دەهاتێ و پێ دەکەنین و زوڕنایان بۆ ترەفیك لایتەکان لێ دەدا.

پاڵەوانەکە تەلی بێ دەنگیی پچڕاندو بەو ئاپوورەی گوت دەوری پاکەت فرۆشێکیان دابوو: (پێم کرابا ئاگر کوژێنەوەم دێناو، هەموو ئەم گالیسکەو وردە فرۆش و ئاردفرۆش و شەکر فرۆشەم پێ دەخوساند، جا بزانم کێ دەیوێرا، توخنی چەقی شارەکە بکەوێت!!).

دڕی بە ئاپوورە داو ماوەیەك بەشەقامە جەنجاڵەکەی دیکەدا شۆڕبووەوە، کووچەیەك قووتی داو هەڵی لووشی، لەدەرگەیەك وەژوور کەوت، ماندوویەتی جڵەوی لێ ستاندبوو، قەرەوێڵەکە باوەشی بۆ گرتەوە!

فەرمانی دایە کرێکارەکان، شۆفێرەکان، شەڤڵ و، گرێدەریان ئامادە کرد، ئەندازیارەکان ئامادەبوون، گلاّبەو عەرەبانەی دووی مەکینەکان ڕیزکران، چەند پۆلیسێك سواری پیکابەکان بوون، بەو بەیانییە زووە ڕوویان کردە شەقامی شار، لەو لاوەیش دوو سێ ئۆتۆمبیلی ئاگر کوژێنەوە بەشاورو شووت لێ دانی بڵندەوە گەیشتنە جێ و، لاکەناریان گرت، سەرۆکی پۆلیسی شار بەخۆی و پاسەوانەکانیەوە گەیشتن! سەرۆکی شارەوانی مایکرۆفۆنێکی هێناو فووی پێدا کرد:

ـ برادەرینە، خەڵکی شارە خۆشەویستەکەمان، ئێمە لەپێناوی ئێوەدا ئەم کارە دەکەین، ئەم چەقی ڕێگەیە چەقی پایتەختە خۆشەویستەکەمانە، ڕێگەی هەموومانە، نابێت کەس داگیری بکات، یاسا بۆ ئۆتۆمبیل و پیادەو ڕێبوارانی تەرخان کردووە، تکام ئەوەیە هەرکەسەو گالیسکەی خۆی

بکێشێتەوەو لەم دەوروبەرە دووربکەوێتەوە، تا بەر شەپۆلی ئاوو زاری شەقڵ نەکەوێت.

ئاپوورەی خاوەن گالیسکەو منداڵە وردەفرۆشەکان پەموویان لەگوێی خۆ نابوو، هیچیان نەدەبیست و لەشوێنی خۆیشیان نەبزووان!

سەرۆکی شارەوانی فەرمانی بەشەقڵ و ئوتری ئاگر کوژێنەوەکان دا، شەقڵ زاری لێ خستە کارو، نەڕەی ڕۆژە ڕێیەك دەچوو، کەوتە وێزەی گالیسکەکان، هەر گالیسکە بوو، بەشەکرو چاو سابوون و میوەو وردەواڵەوە بەرز دەبووەوەو دەچووە گەرووی شەقڵەوەو لەناو (گەلابە)دا ڕۆدەکرا، ئاپوورەکە ئەوەی پێکرا هەرکەسەو گالیسکەی خۆی ڕزگار بکات، فرکان فرکانێك بوو، تەپ و تۆز بەردەم ڕۆژی گرتبوو، شۆستە لەتەماشاکەراندا جمەی دەهات، ئەمجار ئۆتۆمبیلی ئاگر کوژێنەوەکان سۆندە گەورەو درێژەکانیان دەرهێناو، ئاوە بەتەوژم و تیژەکانیان بەرەڵڵا کرد، لافاو هەستا شەقامەکەی گرتەوەو، هەر ئاردو شەکرو برنج و چاو سەوزەو میوە بوو، سەر لافاو کەوتبوو، بەشەقامی لای سینەماکەدا شەپۆلی دەدایەوەو چەند منداڵێکی هێلکەفرۆش بەخۆیان و سندووقە هێلکەوە سەر لافاوەکە کەوتبوون، قووتیان دەخواردەوە، خەریك بوون دەخنکان!

لافاوێکی بێ سنوور هەڵسا، بەشەقامی بەردەم یانەی کۆندا ڕووەو گەڕەکی جووەکان کەوتە ڕێ و گالیسکەو

تایەو کەلوپەل و شت و مەکی سەر لافاوەکە دڕیان بەیەك دی دەدا، لەخوارووی شارەوە هەر گالیسکە شکاوبوو لەئاوەڕۆ کەنار دەکەوت.

سەرۆکی شارەوانی هەستی بەبەهێزی خۆی دەکرد، گەز گەز بالآی دەکرد، هەستی دەکرد یاسا سەروەرە، یاسا هەموو شتێکی پێ دەکرێت، دەیبینی باخچەی شارو گۆڕەپانە مەزنەکەو، شەقامەکانی دەورروبەر پاك و خاوێن و چۆڵ و هۆڵن!

بزەی دەهاتێ و دەیگوت: ئەمە شارە، ئەمە پایتەختە، ئەمە یاسایە!

هەر یاسا دەتوانێت ئەم سەرکەوتنە مەزنە وەدەست بهێنێت!

پشتی لەخەڵکەکە بوو، ئاوڕی دایەوە، لەدیوی لای سینەماکەوە، ئاپوورەیەك خەڵك بەخۆیان و گالیسکەوە، بەرەو ڕوویان دەهاتن، بەردو بەردەقانێ و کوتەك و هێلکەی پیسیان کردبوونە چەکی دەستی خۆیان، ددانیان جیڕ کردبووەوە، ئاگری تووڕەیی لەڕوویان دەپڕژاو دەباری، تا دەهات نزیك دەبوونەوە، بەچەکی دەستیان هێرشیان دەهێنا، بەردیان لەسەرۆکی شارەوانی دەگرت، هێلکەی پیسیان بۆ کرێکارەکان فڕێ دەدا، هەر کرێکاربوو بەهەڵەداوان ئەو ناوەی بەجێ دەهێشت و خێرا خۆیان لەئۆتۆمبێلەکان دەپەستاو هەڵ دەهاتن!

سەرۆکی شارەوانی واقی ورمابوو، دەم و زاری تەرەکیبوو!

ئاپوورەکەی لێ نزیک بووەوەو بەر بەردو هێلکە پیسۆکەیان دا، بەردێك بەر تەوقی سەری کەوت و، چەند هێلکە پیسۆکەیش بەردەم و چاوی کەوتن و چۆڕاوگەیان بەست. پاڵەوانەکە لەویٰ زەق زەق سەرنجی دەدا، زاری ببووە تەڵەی تەقیو، چەند هێلکە پیسۆکەیش بەرسەری وی کەوتن، دەستی برد پاکیان بکاتەوە، بەردێك بەر تەوقی سەری کەوت، زۆری ئێش پێ گەیاند، لەئەژمەتدا خۆی راپسکاند لەسەر قەرەوێڵەکە بەر بووەوەو، چاوی کلۆوفاند، لەبن مێچی ژوورەکە ڕستەیەکی خوێندەوە:

چەقی شار.. بێ تەقە گیرایەوە!!

هەولێر ٢ -٢-١٩٩٧

# مانگی دەستکرد

سـاڵ دوو هـەزارو دەیـە، نووسـەرێك بەرانبـەر بەکـەناڵی (زێـــڕین)ی ئاسمـــانی ڕۆنیشـــتووەو، پەڕتووکـــە بـــەرگ ئەسـتووره زەبەلاحەکـەی دەسـتی لەسـەر مێزەکـە دانـاوەو، قەیتانــە ڕەشـــەکەی لـــەو لاپەڕەیـــەدا هەڵکێشـــاوە، کـــە گەیشـتووەتە خوێندنـەوەی و، ڕووداوی نـاو پەڕتووکەکـە بەســــەرهاتی لەناوچـــوونی ئەمپراتۆریـــەتی بـــەردین دەگێڕێتەوەو، چۆن شاری (نەزۆك) بەر شاڵاوی هێرشی شیر بەدەسـتەکانی دوژمـــن کـــەوت و، چـــۆن منداڵـــە ســـاواو بەرمەکـەکانیان لـەدایکان کـردو، ژنـە زوڵـف شـۆڕەکانیان لەبـەرداو، پیاوەکانیشـیان قـۆڵ بەسـت کردبـوون و، مـەڕو ماڵاتەکانیشیان بەرەو ڕۆژهەڵات کردبوونەوە!!

ئـەم نووسـەرە، بەدەگمـەن پـەردەی تەلـەڤزیۆن سـەرنجی بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت، ڕێکەوت وای کرد، پل بەدوگمـەی کەناڵی (زێڕین)دا بنێت و، گوێی لەبێژەرەکە بێت بەوپـەڕی شـادی و بـەبزەو زەردەخەنـەوە بەبینـەران ڕابگەیـەنێت کـە شەوچـەرەی ئـەم شـەویان لەگـەڵ شـاعیرێکی ئـاوارەی دوور وڵاتدا دەبێت و، نمرەی تەلەفۆن بەبینەرانی شارەکانی وڵات ڕادەگەیـەنێت، بەتەلـەفۆن پرسـیار لەشـاعیری بلیمـەت و

خاوەن ئەزموونی دوورو درێژ بکەن و گوێ لەوەڵامە بەپێزو داهێنەرەکانی بگرن!

لەستۆدیۆی کەناڵی تەلەفزیۆندا، بێژەر لەسەر کورسییەك ڕۆنیشتووەو مێزێکی لەبەردەمدایە دۆڵکەیەکی پڕ ئاوو پەرداخێك و چەند ئامێرێکی تەلەفۆن و فاکسی لەسەرەو، پەردەیەکی تەلەڤزیۆنیشی لەلاڕاستەوەیە، لەستۆدیۆیەکی دیکەی تەلەڤزیۆنی لەشاری (گردێ)وە شاعیری دوورە وڵات لەسەر کورسییەك ڕۆنیشتووە. مێزێکی درێژی لەبەردەستدایە، پەردەیەکی تەلەڤزیۆنیی لەتەنیشتەوەیە، کە بینەر بەتەلەفۆن دەتوانێت قسەی لەگەڵ بکات و، گوێی لەوەڵامەکەی ببێت. جگە لەئامێرێکی تەلەڤزیۆن کە کاکی بێژەرو شاعیر تەماشای دەکەن، خۆیانی تێدا دەبینن. لەستۆدیۆی یەکەمدا چەند کامێرایەکی تەلەڤزیۆنی و لەستۆدیۆی دووەمدا چوار کامێرای تەلەڤزیۆنی دانراوون، لەستۆدیۆی یەکەمدا کامێراکان ڕوو لەبێژەرن و لەدووەمیشدا چوار کامێراکە لەچوار شوێنی جیاجیاوە ڕوویان لە شاعیرە.

دوو سێ بوتڵی سپی و چەند پەرداخ و چەند قاپی مەزەو زەلاتەو گۆشت و جەرگ و گورچیلەی برژاویش لەناو قاپدا لەبەردەم شاعیردا لەسەر مێزەکە دانراوون!!

بێژەرەکە پێش ئەوەی بینەران پرسیار بکەن، وا بەباش دەزانێت چەند پرسیارێك لەشاعیر بکات، دەفەرموێت لەبەرئەوەی شاعیری ئەم شەومان ئەوەند ناسراوە پێی

ناوێت لەکورتەی ژیان و لەخەرمانە دیوانەکانی بدوێین، یەکسەر دەچینە نێو شەو چەرەکەمانەوەو لێی دەپرسین:

- کاکە گیان، بەڕای تۆ مەی نۆشین چ پێوەندییەکی بەشیعرەوە هەیە؟!

شاعیری دوور وڵات، لەستۆدیۆکەوە پەرداخەکەی بەرز دەکاتەوەو تا نیوەی هەڵدەدات و، دایدەنێتەوەو، ملچە ملچێکی بۆ دەکات، بە پالێمی (پایین)ی قۆڵی چاکەتەکەی لێوی دەسڕێت و، دوو سێ کەوچك مەزەو زەلاتەیش بەو دیودا دەکات و، مژێك لەجگەرەکەی دەدات و، چاویلکە خوارەکەی ڕاست دەکاتەوەو دەست بۆ بۆینباغەکەی دەبات و ئەم جار دەڵێت:

- ئەوەی ڕاستی بێت، تا ئێستە پرسیاری قورسی لەو جۆرەم لێ نەکراوە، تۆ دەتەوێت تاقیم بکەیتەوە، یان دەربارەی خەرمانی دیوانەکان و سەرگوزەشتەم پرسیارم لێ بکەیت؟

هەر چۆنێك بێت، من وەڵامت دەدەمەوە.

بەلای منەوە مەی ڕەگ و ڕیشەی شیعرە، شیعرەکانم لەناو بەرمیلێك مەیدا دەشۆمەوە، پاشان هەڵیان دەهێنجێنم. نایانبینیت بۆنی (مەی)یان لێ دێت؟ لای من مەی ڕووبار بووایە هەموو ساڵێك خۆم تێدا دەشوشت بەمەلەوانی ئەم کەنارو ئەو کەناریم دەبڕی و تێیدا قووتم دەخواردەوە!! زەریا بووایە دەبوومە ماسی و هەڵم

دەلووشی!! بۆئەوەی هەر شیعری ڕەسەنی لێ هەڵێنجێنم و بۆن و بەرامەی بەلووتی خوێنەراندا بدەم!

مەی لەشیعرەو شیعر لە مەی!! بۆیە پێوەندیی هەردووکیان بەلای منەوە ژیانەو ژیانیش بێ هەردووکیان مردنە!!

بێژەر پرسیارێکی دیکەی بۆ ئامادە دەکات: باشە لەم بزووتنەوە نوێخوازییەدا هیچ شاعیرو ڕەخنەگرو نووسەری دیکەت لەگەڵ نەبوو؟

پێش ئەوەی شاعیر وەڵام بداتەوە، پەرداخە مەیەکەی تەواو فڕ دەکات و، شیشە گۆشتێك هەڵدەگرێت و، دانە دانە قاژە گۆشتە برژاوەکانی لەدەو دەنێت و، کاکی بێژەر لەم لاوە خۆی پێ ڕاناگیرێت لیك لەدەمی ڕێچکە دەبەستێت و، بەبەرچاوی بینەرانەوە کلینیکسێك دەردێنێت و، دەمی خۆی دەسڕێت.

شاعیری دوور وڵات شیشە بەتاڵەکە دادەنێتەوەو، بەچمکی چاکەتەکەی دەمی دەسڕێت و بەنرخە نرخ دەڵێت:

. ببورە.. دەمویست شیشە گۆشتەکانی دیکەش بەتاڵ بکەم!! تا شەوچەرەی ئەم شەومان بەلەزەت تر بێت!!

پرسیارەکەت پێویست بە وەڵامێکی دوورو درێژ دەکات.. ئەو ڕێڕەوی نوێخوازییەی من.. تەنیا هی خۆمەو خۆم داهێناوە!! کەسم دەگەڵ نەبووە!! کوا کام شاعیر داهێنانێکی وەك چامەی (هێلکەی دووگیان)ی گوتووە!! کام شاعیر چامەی (نانی نەخوراو)ی گوتووە!!

کام شاعیر وێنەی (دڕکە زێ سك پڕەکان)ی داهێناوە!! کاتێك من ئەو نوێخوازییەم داهێنا، شاعیرەکان هێشتە لەناو دۆشەکی سەروای سواودا پڕخەیان دەهات!! کەس بێدار نەبوو تەنیا خۆم و پەرداخەکەم و بوتڵی مەی نەبێت!!

بێژەر لەبەرخۆیەوە دەڵێت:

. دەك ماڵی درۆت وێران بێت، بۆ خۆت و ڕاستیت، خۆ خەریکە ستۆدیۆکەمان بەسەردا داڕووخێت!! ئەی ئەوە نەبوو شاعیرانی شاری (زێ) و شاری (ڕێ) پێش تۆ شیعرە نوێیەکانیان دەگوت و بڵاودەکردەوەو، چەندین کۆڕیان لەمەڕ دەگێڕاو لەپەردەی تەلەڤزیۆنی شاری (زێ) وە بڵاویان دەکردەوە، تۆیش لەشاری (گردێ) لاقی نووستنت لێ ڕاکێشابوو!!

زڕەی تەلەفۆن دێت و بینەرێك و دوو بینەرو سێ بینەر پرسیاری خۆیان دەکەن. شاعیر دەست ڕادەوەشێنێت و کەف دەچەرێنێت و مەزەی هەمەڕەنگ بەو دیودا دەکات، پێش ئەوەیش پەرداخە مەی هەڵ دەدات و لەوەڵامی پرسیارێکدا دەڵێت:

- بێ من شیعر کۆچ دەکات، زوڵفەکانی دەپتورکێن، چاوەکانی لێڵاییان دادێت، سەرواکانی بزر دەبن، بێ من شیعر بەلادا دێت و، بەدەستی شاعیرە نەزانەکانەوە گۆڕی بۆ هەڵ دەکەنرێت!! کەواتە من هەبم شیعر دەبێت!! کە من نەمام فاتیحەی شیعر دەخوێنرێت!!

لەم کاتانەدا بینەرێك پرسیارێك دەکات: ئایە ڕای شاعیر دەربارەی چارەنووس و خاك و شیعری پاشەڕۆژ چییە؟

شاعیر دەیەوێت وەڵام بداتەوە، لەپڕ وێنەی شاعیر لەسەر پەردەی تەلەڤزیۆنی لای دەستە ڕاستی بێژەرەوە نامێنێت.

بێژەر هەڵ دەداتێ:

ــ بینەرە بەڕێزەکان.. داوای لێبوردن و پۆزشتان لێ دەکەین، وابزانم هەڵەیەکی تەکنیکی ڕووی داوە. هەڵەکە چاك بکرێتەوە.. شەوچەرەکەمان تا سەر بەردەوام دەبێت!

کەچی چەند خولەکێك بینەران واقیان وڕ دەمێنێت و، چاو دەچەقێننە دیمەنە ڕاوەستاوەکەی سەر پەردەی تەلەڤزیۆنەکە. لەپڕ بێژەر دووردەکەوێتەوە:

. بینەرە خۆشەویستەکان.. دیسانەوە داوای لێبوردن و پۆزشتان لێ دەکەین، کە ناتوانین شەوچەرەکە تەواو بکەین، چونکە هەر ئێستە ئەم هەواڵە بەپەلەیەمان لەکەناڵی (بی بی ئێن)ەوە پێ گەیشتووە. ئەو مانگە دەستکردەی ڕاستەوخۆ شەوچەرەکەی دەگواستینەوە، ئاودیوکرا.. ببوورن ئاودیوکرا!!

هاوینی ١٩٩٦

# کەروێشك

لەمامۆستاکەتەوە بیستبووت کە کەروێشك گیانلەبەرێکی شوومەو، لەڕێ و بانانـدا تووشـی بەتووشی مرۆڤەوە بێت هێمای نەگبەتی و ڕووداوی خراپ دەگەیەنێت. لەپاڵ ئەوەیشدا کەروێشك نیشانەی زاوزێ کردنی زۆرو سێکس و ئارەزووی سێکسی دەگەیەنێت، ئەگەرچی چل ڕۆژ جارێك دایکانەو باوکانەی ئەم گیانلەبەرە جووت دەبن، بەڵام هەر دایکانەیەك لەچوار بێچوو تا سێزدە بێچوو، بگرە زۆرتریش بەیەك سك دێنێت! لەناو خەڵکیشدا باوە کە گۆشتی کەروێشك دەخورێت و، هەندێك کۆمەڵە خەڵکی دیکەیش هەن گۆشتی کەروێشك ناخۆن، چ کەروێشکی ماڵی، یان چیاو دەشت و بیابان بێت، بیانووی ئەوە دێننەوە ئافرەت ئاسا سکی پڕ دەبێت، بگرە بیانوویەکی سەرسوڕهێنەریش قوت دەکەنەوەو شێوەی گوێ درێژیی ئەم گیانلەبەرە بەگوێ درێژیی (گوێ درێژ)ەوە دەبەستنەوەو ناوەکەی وا لێك دەدەنەوە (کەرگوێچك) بووبێت و، وردە وردە بووبێتە (کەروێشك) بۆیە (بێن) لەخواردنی گۆشتی ئەم گیانلەبەرە بەستەزمانە دەکەنەوەو دەڵێن لەکاتی سەربڕینیشدا دەقیژێنێت و وەك دایکی جەرگ سووتاو هاوار دەکات، لەخۆڕا ئەو گۆشتەی لەخەڵك

بێ بەش دەکەن، کە ئەگەر لەناو ڕۆندا سووربکرێتەوە لەگۆشتی مریشك و قەل جیا ناکرێتەوە.

بۆ ئەم مەبەستەو، بۆئەوەی بەهۆی نالەباری باری ئابووری و کەم دەرامەتی و ئابلۆوقەی چەندین لایەنەوە، کە کارێکی وای کرد ساڵی جارێکیش نەتوانن گۆشت بکڕن و، گۆشت بخۆن و، گۆشتاویش فڕ بکەن، دۆست و برادەران بیرۆکەیەکی باشیان دانێ، کە بڕێك کەروێشك بەخێو بکەن و، سووچێکی باخچە بچووکەکەی بۆ تەرخان بکەن و، لەئەنجامی زاوزێوە تێر تێر گۆشتی سوورکراوەی نێو ڕۆن بخۆن و بین و تینی چاوتان بەهێزتر بکەن. بەپەلە ویستت ئەم پرۆژەیە جێبەجێ بکەیت، ناسیاوێك جووتێك کەروێشکی مێینەی پێ بەخشین، بەدوای نێرینەیەکدا دەگەڕایت.

لەسەردانێکی ماڵی خوشکەکەتدا، کە لەگوندێکی دووری ئەو پێدەشتەی ئەو لاوەن نێرینەیەکی گەنم ڕەنگی و مێینەیەکی ڕەش و سپیت پەیداکرد. لەناو کارتۆنێکدا بەو گەرمای هاوینە گەیاندنتە شارو چوار کەروێشکت لەسووچێکی باخچە بچکۆڵەکەدا بەرەڵڵا کرد.

قۆرتێکت هەڵکەندو، جۆرە هێلانەیەکی کونجاوت لەژێر دارتووەکەدا دروست کرد، بۆ گیاو گۆڵەیش، لەبازاڕ سەوزەو تەرەتوولەو کەرەوزت دەکڕی و، دەتهێنایەوەو دەرخواردی کەروێشکەکانت دەدا، بەیانیان سەر لەزوویش بەگونیەیەکەوە دەچوویتە ناو گۆڕستانەکەی نزیك

بەگـەڕەکی ئەولاتانـەوەو گونییـەك گیـاو گۆڵـەت دێنـاو یـەك دوو ڕۆژ خـۆراکی کەروێشـکەکانت دابـین دەکرد،سـەرەڕای پاشمـاوەی زۆرکـەمی ئـەو چێشـتە کەمـەی هەفتـەی جارێـك یـان دووجـار لێتـان دەنـاو دەمایـەوە، جگـە نانـە ڕەقـە، کـە هـەردوو کەروێشـکی ناسـیاوەکەت بـاش فێـری خـواردنی ببوون.

ئەم هـەوڵ و کۆششـەت بۆ ئەوەبوو چوار کەروێشـکەکە زاوزێ بکـەن، بێچـووەکان گـەورە بـبن، سـەریان ببڕیـت، گۆشـتەکەیان سووربکەیتەوە، خـۆت و منداڵـەکانت لـەم بـێ گۆشتییەدا تێر گۆشت بخۆن.

زانیـاریی زۆرت لـەبارەی کەروێشـکەوە پەیـداکردبوو، کاتی خۆشی یەکەمین جار ئاشنایەتیت لەگەڵ کەروێشکدا پەیـداکرد، خۆیشـت سـەرت لێ سـوڕدەمێنێت. بـەرەو کێڵگـەکانی خاڵوانـت دەچوویت، لەگوندەکـەوە بەتەپۆڵکـەو بەرزاییەکاندا هەڵ زنایت، بەبانە پان و پۆڕەکەدا تێپـەڕیت و، بـەرەو دەشـتاییە نزمەکـە شـۆڕ بوویتـەوە، بـەهارێکی ڕەنگین بوو، دەغڵ و دان و گیـاو گۆڵە ئەو دەشـتەیان شین کردبـوو، لـەپڕ لـەناو کێڵگـە گەنمێکـدا کەروێشـکێکی زل سڵەمییەوەو بەبەر چاوتەوە دەرپـەڕی و بەناو دەغڵ و دانە تازە شین بووەکەدا لەچاو بزر بوو.

هـەر ئـەو ماوەیـە ئـامۆزای باوکـت سـەری لێ دان و، لیپۆشێکی لێ بەشاندا کردو بەرەو ئەو چۆڵەوانییە لەگەڵ تۆو باوکتدا، بۆ ڕاو، بەڕێ کەوتن.

لەدۆڵێکـدا کەروێشـکێکی زلتـان هەڵسـاند، ئامۆزاکـەی باوکت نیشان شکێنێکی دەست ڕاست بوو، بۆی دانیشت و هەرکە تەقەی کرد، کەروێشکەکە لەو دوورەوە لنگاو قووچ لێی کەوت، پڕتان دایەو گەیشتنە سەری و، بەو چەقۆیەی پێتان بوو سەرتان بڕی. کاتێك بەرەو ماڵ بوونەوە، دایکت کەروێشکەکەی بردە سەر کانیی گوندو لەوێ پاکی کرد. بۆی گێڕانەوە کە کەروێشکەکە دایکانە بووەو (نۆ) بێچووی لە سکدا بووە. ئیدی لەوکاتەوە دەتزانی کەروێشك تەنیا گیانلەبەرێکە بەیەك سك ژمارەیەکی زۆر بێچووی دەبێت.

شـــوومی و نەگبـــەتی کەروێشـــك تـــاقی کراوەتـــەوە، ماموستاکەت دەیگێڕایەوە کە لەگوندەوە، لەگەڵ ژمارەیەك قوتابیـانی پـۆلی شەشدا بـەرەو مەڵبەنـدی قـەزا دەچـن، بـۆ تاقیکردنـەوەی بەکـەلۆریا، لەڕێگـە کەروێشـکێکیان تـووش دەبێـت، کـە تاقیکردنـەوە تـەواو دەکـەن و، دواتـر ئـەنجام دەردەکـــەوێت، دەبیـــنن تـــەنیا قوتابیـــەکیان چـــییە سەرنەکەوتووە.

هەموو ئەو بیرە کۆنە ورووژاوانەت پشت گوێ خست و، بەوپـەڕی ئارەزوومەندییـەوە، چـاودێری کەروێشـکەکانت دەکرد.

ڕۆژێکیـان هاتیتـەوە خێزانەکـەت پێـی ڕاگەیانـدیت کـە یـەکێك لەکەروێشـکەکان خـەریکی پـەڕۆ پاتـاڵ بردنـە کونەوەیـە، ئـەو گیانلەبـەرە بۆئـەوە پـەڕۆو پاتـاڵ دەباتـە

کونـەوە بۆئـەوەی کـە بێچـووی بـوو بکەوێتـە سـەر ئـەو پەڕۆیانەو لەناویاندا گەورە ببێت.

پـاش چـل ڕۆژ بێچـووی دەبێـت و، دێتـە دەرەوە، باوکانەکە بۆنی پێوە دەکات و، دەست بەجێ کاری خۆی لەگـەڵدا ساز دەدات و جـووت دەبـن، ئیـدی تـا چـل ڕۆژی دیکە توخنی ناکەوێت.

ماوەیەك ئاوی چاوی چاوەڕوانیتان داهات، لەپڕ ڕۆژێك بێچـووە کەروێشـکێکی ڕەش و سـپی هاتـە دەرەوە، پاشـان بوو بە دوو، بەسێ، بەحـەوت بێچووە کەروێشك، دانەیـەکی سـپی جوانیـان تێـدابوو، دراوسـێ و ئەوانـەی دەیـانبینی دڵیان لێ دەچوو.

کەروێشـکیش مێملـی هەیـە، ئـەویش پشـیلەیە. بـۆرە پشـیلەیەکی زل فێـری کەروێشـکەکان بـوو، سـەرەتا ئـەو بێچووە سپییەی خوارد، بەدوایدا گەڕایت، پاشماوەکەیتان لەبن دارە تووەکەدا دۆزییەوە.

بێچـووەکان نـەیان دەتـوانی لەباخچـەکەدا مـڵ و مـووش بکـەن لێیـان پەیـدادەبوو دەیقەپانـدن. تـۆیش کەوتیتـە چـاودێری بـۆرە پشـیلەو چـەند بێچـووە کەروێشـکتان پـێ گەیانـد، باوکانەکـە لـەناو ئـەو ڕەوە بێچـووانەدا دوو دانـەی ڕاودەنان، ڕێی نەدەدا لەکون بێنە دەر، پاشـان زانیتـان ئـەو دووانـە نێرینـەن و، کەروێشـك ڕێ نـادات لەنێرینەیـەك پـتر لەناو ڕەوە کەروێشکێکدا هەبێت!!

جارێك، دووجار. دوو سێ لەو بێچووانەتان سەربڕی و، لەبەر قسەو قسەڵۆکی خەڵکی و بێزهاتنەوە لەخوێن و زاوزێی کەروێشك و (گوێ)ی درێژی کەروێشك، لەناو ڕۆندا سوورتان دەکردەوەو، بەقێزو بێزەوە، دەتانخوارد، بەڵام چێژی لەچێژی گۆشتی مریشك کەمتر نەبوو!

کیژێکی ناسیاوتان، کە لەکۆلێژ دەیخوێند، لەگەڵ دەستە خوشکێکیدا ڕێیان کەوتە ماڵتان، نیوە ڕۆژەیان نەکردبوو، بەخۆیان چێشت و گۆشتیان گەرم کردەوە، تێرو پڕیان خوارد. پاشان دەست بەباسکردنی خۆشی و بەچێژی گۆشتی کەروێشك کرا. لەو مشت و مڕەدا سوێندیان خوارد کە گۆشتی کەروێشکیان نەخواردووەو، بەتامەزرۆوەن بیخۆن. ئێوەیش پرسیتان:

. ئەی ئەو گۆشتەی نیوەڕۆ خواردتان چی بوو؟

. ئەوە گۆشتی مریشك بوو!!

. مریشکی چی! ئەوە گۆشتی کەروێشك بوو.

بەخوا ئەوەندە خۆش بوو، چێژی هەر تەواو نابێت.

حەزدەکەم ڕۆژێکیان بچمە بازاڕو کەروێشکێك بکڕم و بەو شێوەیە بۆمان سوور بکەنەوە.

تا دەهات ژمارەی بێچووە کەروێشك زۆرتر دەبوو، تۆیش شانت لێ بەلادا کردبوو، لەلایەك گۆشتی کەروێشك، لەلایەکی دیکەوە پاسەوانی کردنی بێچووەکان لەپشیلە بۆر، کە پڕی دایە دانەیەکی دیکەو، بەسەر دیواری

دراوسێکەتاندا ڕفاندی و دادو هاواری ئەوان و منداڵەکان سوودیان نەبوو.

یەکێك لەدایکانەکان بێچووەکانی بەخێو نەدەکرد دەتویست بیخەیتە کونەوە شیریان بداتێ، لەکوندا مردار بووەوە، یەکێکی دیکەیشی لەگەڵدا مردار بووەوە، کە حەوت بێچووی لەسکدا بوو.

دار تووەکەتان لەتەنیشت دیواری باخچەکەوە ڕووەو ئاسمان هەڵزنابوو، پشیلە بۆر خۆی پێدا شۆڕ دەکردەوەو بەناو ئەو هەموو داوو تێڵبەندانەی دروستتان کردبوو خۆی دەگەیاندە بێچووەکان. ئێوارەیەك زیکەی لێ هەڵسااندن، بەدەم زریکەوە پڕتان دایەو لەناو لقی دار هەنجیرەکەی ئەم لاوە دەستت لەبینەقاقەی پشیلە بۆرنا، کە لاقی بێچوویەکی بەدەمەوە بوو دەیزیکاند، توند توند قوڕگت گرت. بێچووەکەت لەدەم دەرهانی. لاقی شکابوو. پاش دوو ڕۆژ مرداربووەوە.

دارکارییەکی باشی پشیلە بۆرت کرد، گونیەکت هێناو لەناو گونیەت پەستاندو، لەژێر مەنجەڵێکی گەورەت دانا، تا سبەینێ لەوپەڕی شارەوە بەرەڵای بکەیت و، بەوناوەدا نەیەتەوە.

دەڵێن پشیلە کوشتن دەبێتە هۆی کارەساتی دڵتەزێن بۆ ئەو کەسەی بیکوژێت. بەڵام تۆ نیازی ئەوەت نەبوو پشیلە بۆر بکوژێت. گوێت لێ بوو لەژێر مەنجەڵەکەوە مرخەمرخی

دەکــرد. کــە ڕۆژ بــووەوە ســەری مەنجەڵەکــەت هەڵدایــەوە پشیلەکە گیانی سپاردبوو.

خــۆت و خێزانەکــەت نیگــەران بــوون، بەتایبــەتی خێزانەکـەت دەترسا منداڵـەکان شتێکیان بەسـەربێت. هـەر پرتەو بۆڵەی بوو.

بۆ ئێوارە هاتیتەوە دیتت هەر پێنج منداڵەکەت لەرزوتا گرتــوونی و لــەناو جێگــەدا ڕاکشــاون و، پرتــەو بۆڵــەی خێزانەکـەت ســەرو دڵ و دەروونــی گرتیــت. بڕیارتــان دا هەرکــە منداڵــەکان چــاك ببنــەوە، چــی کەروێشــك هــەن، بەدایکانەو باوکانەوە سەر ببڕن.

لەدڵی خۆتاندا گوتتان:

ـ ئەمــەیش بــەزمی ئابڵووقــەو بــێ گۆشــتی و ئــەوەیش بەزمی کەروێشك و گۆشتی کەروێشك بوو!

هەولێر١٥. ٨ . ١٩٩٨

# دراوسێ

زۆر جارم لێ بیستبوو سکاڵای لەدەستی دراوسێکەیان دەکرد، ڕۆژێکیان پێکەوە لە باخچەی قوتابخانەدا دانیشتبووین ویستم زۆرترم لەبارەی دراوسێکەیانەوە بۆ بدوێت، لێم پرسی:

. ئێستە لەگەڵ دراوسێکەتاندا چۆنن؟

سەرێکی بۆ لەقاندو ئەسپی وشەی لێ تاوداو گوتی:

– خانووەکەمان لەنێوان شەقامێکی گشتی و گەڕەکێکیکوردەواریدایە، کۆڵانەکەمان ڕووەو دیواری فێرگەیەکە، لەناو جەرگەی شاردایە، نزیک بەبازاڕو شوێنە گشتییەکانە، هەراو هۆریای هات و چۆی ئۆتۆمبێل ڕۆژو شەو هەراسان و بێزاری کردووین، لەپاڵ ئەوەیشدا زیل و بەمی فێرخوازان و هەرای فرۆشیارە گەڕۆکەکان سەری ئێشاندووین.

. مەبەستت لەم زانیارییانە چییە؟

. تا ڕوونی کەمەوە کە ئەوانەی باسم کردن کار لەڕەوتی ژیانی ڕۆژانەمان ناکەن و، بوونەتە شتێکی ئاسایی و لێیان ڕاهاتووین.

. باشە سکاڵاتان لەچی هەیە؟

ـ ڕیزە خانووەکانمان لەپێنج خانووی یەك نهۆمی پێکهاتووە، خانووەکەی ئێمە لە ناوەڕاستی ئەو چوار

**خانووەکەدایـە، دوو دەرگـە کەوتوونەتـە لای ڕاسـت و دوو دەرگەیش کەوتووەتە لای چەپمان.**

**دراوسـێکەی مەبەسـتتە، دراوسـێی دەسـتە چـەپمانە، دراوسـێیەکە، لەوکاتـەوە بووینەتـە دراوسـێیان زۆر کـەم پیاوەکـەیان دەبیـنین، بـەیانیان زوو لـەماڵ دەچـێتە دەر، درەنگانێـك دێتـەوە، خـەڵك لەشـیرینیی خـەودا بـن، بۆیـە شێوەو ڕەنگیمان لەیاد چووەتەوە.**

**- باشە دراوسێکەتان هەر تەنیا خۆیەتی؟**

**- ئـەم دراوسـێمانە ژنێـك و شـەش منـداڵی هەیـە، چـوار کـوڕو دوو کچ. دەڵـێن ژنەکـەی بەدڵداری خواستووە. کـاتی خـۆی ئەوەنـد جـوان بـووە دەتگـوت مانگێکـە بـۆ خـۆی ئـەو نـاوەی ڕوونـاك کردووەتـەوەو، ئافرەتـانی گـەڕەك وای بـاس دەکـەن کـە ژیـرو سـەلارو ڕەوشـت جـوان بـووەو سـوێندیان بەسەر خواردووە.**

**دەڵـێن ئـەو ئافرەتـە سـەلارو ژیـرە، پـاش ئـەوەی یـەکێك لەمنداڵـەکانی دەبێـت، تووشـی پەرکـەم دەبێـت، دەپەڕێتـە سەری، تێك دەچێت، ئیدی لـەو ڕۆژەوە چارەسـەر نامێنێـت بـۆی نەکـەن، سـەری لـەکارەبا دەدەن، ئـەم پزیشـك و ئـەو پزیشـکی پـێ دەکـەن، تادێـت ڕووەو تێکچـوونی زۆرتـر دەچـێت. لـەم ماوەیـەدا کـە ئێمـە بووینەتـە دراوسـێیان زۆرشتمان لێ دیوە.**

**جارێکیان هەرچی ناوماڵەیان هەبوو فڕێی دانە دەرەوە.**

جل و بەرگ و کەل و پەل و قاپ و قاچاغ فڕێ درانە ناو کۆڵان. هەرکەسە دەهات و شتێکی هەڵ دەگرت و دەیبرد.

ڕۆژێکی دیکە چی کەل و پەلی منداڵەکانی هەبوو هەمووی فڕێ دایە ناو کۆڵان و هەندێکی دیکەی شیتاڵ شیتاڵ کرد. ئێستە بچیت تەماشای ناوماڵیان بکەیت هیچ نابینیت، ماڵێکی ڕووت و قووت و ڕەجاڵ. تەنیا چەند دەستە پێخەفێکی شڕو هوڕو هیچی دیکەیان نەماوە. نازانم چۆن شیو دەکەن و چا لەچیدا لێ دەنێن و چۆن خۆ دەشۆن و لەسەرماو گەرمادا چۆن دەژین؟

ئەوساکە پیاوەکە هەموو جۆرە خواردن و خۆراکێکی بۆ دابین دەکردن، لەهیچیان کەم نەبوو. ماوەیەکە دەستی لێ شوشتوون.

هەتاو هەڵنایەت دەچێت، پاش نیوەشەوێکی درەنگ دێتەوە، ئاگەی لەژن و دوو منداڵە بچووکەکەی نییە، چی دەخۆن؟ لەکوێ نان پەیدا دەکەن؟ تەنیا ئاگەی لەسکی خۆیەتی چی دەردەکات لەسەر مێزی خواردنەوە بەبایدا دەدات و بەسەرخۆشی دێتەوەو لەناو پێخەفێکی شڕدا تا بەیانی ئاگەی لەخۆی نامێنێت.

سبەینان دەڕوات و هەمان شێو تا شەوی درەنگ ئاگەی نە لەماڵ. نە لەژن. نە لەکوڕو نە لەکچ نییە.

. باشە دوو کوڕو کچەکەی دیکەی لەکوێن؟

ـ دوو کوڕەکەیشی لەفێرگە دەرهێناوە، لەلای فیتەر ئیشیان پێ دەکات، کچەکەیش ماوەیەکە چووەتە ماڵی (مامی)، دەڵێن بەمێردیان داوە.

تەنیا ژنەکەی و کوڕێکی گۆجی بچکۆڵەو کیژێکی هەشت نۆ ساڵانی لەماڵەوەیە. زۆرجار ژنەکە دەکاتە سەربان و تا ئێوارە بەبەر سەرماو سۆڵە یان لەبەر گەرماو هەتاو لەو سەربانە نایەتە خوارەوە. زۆرجاریش شتێکی بەرز لەژێر پێ دادەنێت و تەماشای کۆڵان دەکات، کوڕو کاڵی گەڕەك و فێرخوازەکانی فێرگە نزیکەکە گاڵتەی پێ دەکەن. کە مێردەکەی بەوەی زانی هەڕەشەی لێ کرد، چیدی لەو ڕۆژە ژنەکە دەنگی هەبوو ڕەنگی نەبوو. لەماڵەوەیە کەس نایبینێت.

ئەو زستانەی هات و چۆ، ئەو ئافرەتە بەو سەرمایە لەو سەربانەی بەسەر برد، مێردەکەی نە ئازووقەیەك نە خۆراکێکیان بۆ ناکڕێت، مەگەر جەژن بە جەژن شتێکیان بە قوڕگدا بکات.

. ئەی چۆن دەژین؟

. کیژە هەشت نۆ ساڵانەکەی ڕۆژ نییەو ژەم نییە دووقاپ بەدەستیەوە نەبێت، ئەم ماڵ و ئەو ماڵ دەکات، شیو، نان، خۆراك، سەوزە، میوە، بگرە ڕۆن و شەکرو چا لەو دراوسێیانەی ئەم لاو ئەولا بۆ دایکی و بۆ خۆی نەهێنێت. کوڕێکی دیکەیان دێتەوە ئەگەر شیو نەبێت دەرگەکە بەر

بەرد دەدات، تا خوشکەکەی دەچێت لەو دراوسێیانە ژەمێک خواردنی بۆ پەیدا دەکات.

کوڕە گۆجەکەیشی کە تەمەنی سێ ساڵ دەبێت، بەمنداڵی بردیانە لای پزیشک چارەسەری بکات، پزیشک ئاگەداری کردن لەشەش مانگیدا بیبەن چارەسەری بکەن، بەڵام باوکەو دایکە پشتگوێیان خست. کە ئەو منداڵە ببینیت دڵت پێ دەسووتێت. قژ زەردێکی جوان بە ئیفلیجی لەبەر دەرگە بەزەوییەوە لکاوەو تەماشای ئەو منداڵانە دەکات کە یاری دەکەن و ئەو ناتوانێت هاریکارییان بکات. لەدڵی خۆیدا سەرزەنشتیی باوکی دەکات کە خەمی چارەسەری نەخوارد. دەڵێن ئەو ئیفلیجییەی زگماکییە، دایکی کە ئەوی لەسکدا بوو چیچکانێ دادەنیشت و ئەو بەستەزمانەیش لەسکیدا نەیتوانیوە پەل و پۆ بهاوێت تا وای لێ هاتووە.

- باشە چۆن لەو دراوسێیە دەگەن؟

- سەرمان لەو دراوسێیە سوڕماوە، چۆن ئەو خێزانەی واپشت گوێ خستووە؟ ئاگەی لێ نییە چی دەخۆن؟ چۆن دەنوون؟ چی لەبەردەکەن؟ تۆ بڵێیت ئۆباڵی ئەو خێزانە بە ئەستۆی کێ بێت؟

- بە ئەستۆی کێ بێت؟ ڕوون و ئاشکرایە لەئەستۆی باوکەکەدایە؟

هیچ شتێکی دیکەیان سەرتان لێ سوڕما بێت؟

ـ تەنیا شتێك مابێت، ئەوەیە كە تەنانەت شوێنی دانیشتن و ئاودەستیان نەماوە. لەباخچەكە دادەنیشن و بەیانیان پاشماوەكەیان فڕێ دەدەنە جۆگەڵەكەی كۆڵان.

بۆن و بەرامەی پیسی لەوناوە بەردەدەن.

ئێمەیش بەدەستیانەوە گیرۆدە بووینە. تۆ بڵێیت كەسێكی دیكە دراوسێی وای هەبێت و خۆی لەو ڕەفتارو هەڵس و كەوتە ناشیرینانە هەڵنەقورتێنێت؟

خوا یارمەتیتان بدات. چۆن بە دەستی دراوسێیەكی واوە خەریك ماون و ناتوانن بەردێك لەشوێنی خۆی بجووڵێنن و چەند وشەیەك بەگوێی كەسانێكدا بدەن، كە پێویستیان بەوەیە گوێ لەوشەی ڕاست و دروست بگرن.

١٩.٨.١٩٩٣

# سالاری خۆشنووس!

جانتاکەی لەپرسگەی ئوتێلەکە داناو بە بەردەستەکەی ئوتێلەکەی گوت:

- کاکە گیان شوێنتان هەیە؟

- بەڵێ، چەند کەسن؟

- تەنیا خۆمم!

- باشە زەحمەت نەبێت، ناسنامەکەم نادەیتێ.. ناوت بنووسم!

ناسنامەکەی پێ داو، لەژووری ژمارە (١٠٤)دا ناونووسی کرد، کلیلەکەی دایە، ئەمیش جانتاکەی هەڵگرت و بەسەر کەوت و، بەڕێڕەوەکەدا گەیشتە ژوورەکەو دەرگەکەی کردەوەو بەژوور کەوت، پاش ئەوەی جانتاکەی لەژوورەکە داناو خۆی گۆڕی، ژووری بەجێ هێشت و دەرگەکەی کلۆم کرد، هاتە خوارەوەو کلیلەکەی دایەوە بەردەستەکە، هەنگاوەکانی بەرەو شۆستەی پڕ لەئاپوورەی شەقامەکانی برد. لەبەردەم کۆگەو موغازە ڕازاوەکاندا پیاوو ئافرەت و کیژو کوڕان هاتوچۆیان دەکرد، گڵۆپی دارتێلە بەرزەکان دریان بەتاریکی سەر لەئێوارە دابوو هەنگاوی هەڵهێنا.. سەری بە مەیخانەیەکدا تەقییەوە، خۆی پێداکرد، لەسووچێکی نیوچە تاریکەوە، لەسەر مێزێکی تەریك ڕۆنیشت.

بەردەستەکە هات و لێی پرسی (فەرموو.. چیت بۆ بهێنم؟) بەچەند وشەیەك داواکانی تێگەیاند.

پاش ماوەیەکی زۆر کەم، سەر مێزەکە بەبوتڵ و مەزەی جۆراوجۆر ڕازایەوەو، تا دەهات بوتڵەکان دەزان، ئەویش تا دەهات جڵەوی هۆشی لەدەست دەدا.. ماوەیەکی زۆری پێ چوو، هەموو بوتڵەکانی چۆڕ بر کرد.. لەسەر ئەسکەمیلیەکە لەتری دەبرد.

بۆیەکەی گازکردو، پارەی خواردنەوەو مەزەو خواردنی سەر مێزەکەی دا، بەلەتر بردنەوە مەیخانەی بەجێ هێشت و، هاتە دەرەوە، هەڵوەستەیەکی کرد، نەیزانی بۆ کوێ بڕوات، سەر بەکوێدا بکات، ناوی ئوتێلەکەی لەبیرکرد کە لێی دابەزیبوو، هەرچی کردو کۆشا بیر ڕابەری نەکرد.. نەیویست پارمەتیی بدات، تەنیا ڕێگەیەکی لەبەردەمدا مابووەوە، دەبوو سەر بەهەموو ئوتێلەکاندا بکات.

لەیەکەمین میوانخانە چووە ژوورەوە، ویستی ڕووەو ڕاڕەوەکە بڕوات بەڕێوەبەری ئوتێل لێی پرسی:

. بۆ کوێ دەڕۆیت؟

. بۆ لای (سالار)ی برادەرم.

. ئێمە کەسمان لانییە ناوی سالار بێت.

پەنجەی پەشیمانی گەست و هاتە دەرەوە، نەختێك ڕۆیشت.. میوانخانەیەکی دیکەی بینی، خۆی پێداکرد:

. کاکە گیان، ئەگەر بەئەرکی نازانن، (سالار) ناوێك لێرە دانەبەزیوە؟

ئەویش لیستەکەی هێنا، لەم سەرەوە تا ئەو سەر ناوەکانی یەك یەك تەماشا کرد، ناوی (سالار)ی تێدا نەبوو.

ناچار، پشتی لەدەرگەی ئوتێل کردو. ڕوو لەشەقام، دەیان ئوتێلی دیکە گەڕا.. پێیەکانی شل بوون، وەنەبوو بڕیار بدات لەناو باخچەیەکدا تا بەیانی بەسەر ببات.. بەڵام لەدوورەوە ئوتێلێکی دیکەی بەدی کرد... لەدڵی خۆیدا گوتی:

با ئەم ئوتێلەیش تاقی بکەمەوە.. بەشکەم خوایە خۆی بێت..!

هێزی بەبەر خۆی هێناو، بەژوور کەوت، لەبەردەم مێزی بەرپرسی ئوتێلدا گیرسایەوە:

- زەحمەت نەبێت (سالار فەرهاد) لێرە دانەبەزیوە؟!

تەماشای لیستەکەی کردو گوتی:

- بەڵێ، لێرە دابەزیوە، بەڵام هێشتە نەهاتووەتەوە!

دیسان بەگومانەوە پرسیاری کردەوە:

- (سالار فەرهاد)ی خۆشنووس، کە خەڵکی شاری (سە...)ە؟

- بەڵێ، بەڵێ، خۆیەتی! بەڵام هێشتە نەگەڕاوەتەوە!

ئەمیش بەشادی و شەرمەزارییەوە، گوتی:

- سا زەحمەت نەبێت... کلیلی ژوورەکەیم بدەیە.. من سالارم، ئەگەر بڕوایش ناکەیت ئەوە ناسنامە کەمە! من لەئێوارەوە بەدوای ئێرەدا دەگەڕێم!

بەرپرسەکەیش پێناسەکەی لێ وەرگرت و تەماشایەکی کرد، دیتی ڕاستە، سالار خۆیەتی.. ناسنامەکەی دایەوەو لەقاقای پێکەنینی دا، هەفتەیەك بیری دەکەوتەوەو هەر پێ دەکەنی و پێ دەکەنی!.

هەولێر ١٩٩٠

# بێچووە پشیلە

بێچـووە پشـیلەیەك هـەبوو، لـەناو باخچـەكەی مـاڵی (ئـاكۆ)دا یـاریی دەكـردو لـەژێر درەختەكانـدا خـۆی دەگەوزانـدو لەسـێبەری دارە زەردەلووەكـەدا نیوەڕۆیـان دەنوست. هـەموو ڕۆژێكیش (ئاكۆ) ئاوی بـۆ دەكـردە نێـو جامۆڵكەیەك، كە تینووی بووایە لێـی دەخواردەوە، خـواردن و گۆشتیشـی بـۆ ئامـادە دەكـردو دەیخسـتە نێـو قاپێـك و لـەنزیك دارە زەردەلووەكـەوە دایـدەنا. بێچـووی خـرپنیش بەوپـەڕی هێمنـی و دڵنیاییـەوە، برسـیی بووایـە، لێـی نزیـك دەبووەوە، لەسـەرخۆ سـكی برسـیی تێردەكرد، ئـەنجا بـەناو گـوڵ و دارەكـانی باخچـەكەدا دەسـتی بـەیاری و ڕمبـازێ دەكرد، بازی دەداو خۆی مـات دەكـرد، لـەپڕ تێـی دەتەقانـدو لەقـەد درەختێـك دەگیرسـایەوە، پاشـان خـۆی فـڕێ دەدایـە سەرهەرێزی باخچەكە.

(ئـاكۆ) بـرا بچـكۆڵەیەكی هـەبوو، پشـیلەی خـۆش دەویسـت، دەهاتـە نێـو باخچـەكەو خـواردنی بـۆ پشـیلەكە دەهێناو یاریی لەگەڵ دەكرد.

ئـەو ڕۆژە (ئـاكۆ) لەخوێندنگـە بـوو، بـرا بچـكۆڵەكەی بەنیازی یاریكردن هاتە نێو باخچەكەو بێچووە پشیلەكەی بینـی لـەژێر یـەكێك لەدرەختەكانـدا لێـی پـاڵ كـەوتبوو، ئـەمیش بـەرەو لای دەچـێت، لەترپـەی پێـی ئەمـدا چـاوە زەدەكانی دەكاتەوە، وەنەوز دەدات و هەڵ دەستێت و كلكـە لەقێی بۆ دەكات. براكەی (ئاكۆ) توولێكی تـەڕی بەدەستەوە

دەبێـت، بەمەبەسـتی پـاکی خـۆی توولێـك بەپشـیلەکەدا دەکێشـێت، بێچـووە پشـیلەیش لەترسـی گیـانی خۆشەویستی خۆیدا، خۆی بەژووری ئەمبارەکەدا دەکات، بەسەر شت و مەکەکاندا خۆی دەگەیەنێتە پەنجەرە ئاسنینە کـون کونەکـە، دەیـەوێت خـۆی لێـوە دەرباز بکـات، کەچـی سەری لەکونی پەنجەرەکە گیر دەکات، هەرچی دەمیاوێنێت و تەقەللا دەکات ناتوانێت سەری دەربهێنێت.

لەم کاتانەدا (ئاکۆ) لەفێرگە دەگەڕێتەوە، گوێی لێ دەبێت کە بێچووە پشیلەکە چیی بەسەر هـاتووەو دەبینێت سـەری ترنجاوەتـە پەنجـەرەی ئەمبارەکـەو دەمیاوێنێـت، زۆری پـێ ناخۆش دەبێت، کوت و پڕ بیرێکی بەمێشکدا دێت، دەچێت هەرەیـەك دەهێنێـت، پێپلکەیـەکی داریـن بەدیوارەکـەدا هەڵدەواسێت، سەردەکەوێت و دەست بەبڕینەوەی شیشی ئاسنینی پەنجەرەکە دەکات، کە دەیبڕێتەوە کونەکە گوشاد دەبێـت و بێچووە پشیلەکە سـەری دەردەهێنێـت و ڕزگـاری دەبێـت. لەخۆشـیاندا کلکـی بـۆ دەلەقێنێتـەوەو دێتـە خـوارەوەو لـەناو هـەرێزی باخچـەکەدا دەسـت بـەڕمبازێ دەکاتەوەو پەیمان بەخۆی دەدات جارێکی دی توخنی ئەو شوێنە تووشانە نەکەوێت.

(ئاکۆ)یش دەچێتە لای برای بچکۆڵەکەی و ئامۆژگاریی دەکات، لەبێچووە پشیلە خنجیلانەکە نەدات و یاریی لەگەڵ بکات و بەزەیی بەگیانلەبەرە بێ زمانەکاندا بێتەوەو خۆشی بوێن، چونکە ئەوانیش مرۆڤ ئاسا مافی ئەوەیان هەیە بژین.

بەغدا ١٩٧٩.٧.١١

# ڕاوەپۆڕ

خەڵکێکی زۆر بووین، لەماڵی لالۆ کەریم کۆبووبووینەوە، لالۆ ئەحمەدی خزمی میوانیان بوو، ئێمەیش ڕۆیشتبووین هاڵ و هەواڵی ئەو خزمانەمان بزانین کە دراوسێی لالۆ ئەحمەدن و پێکەوە لەیەك شاردا نیشتەجێن، دوای بەخێرهاتن و خۆشی و دشی و هەواڵ پرسین گفت و گۆیەکی زۆر هاتە ئاراوە، باسی سەردەمی ڕابردوو باڵی بەسەر گفتوگۆکاندا ڕاکێشابوو، بۆیە ئێمەیش زۆرمان حەز لەو باسانە دەکرد، بەوپەڕی ڕێزەوە گوێمان بۆ شل کردبوون.

لالۆ کەریم مژێکی لەجگەرەکەی داو دووکەڵێکی چڕ بەسەر سەرمانەوە توایەوە، نۆرەی خۆی بەفیڕۆ نەداو دەستی پێ کردو گوتی:

. لەو دێیە ڕاوەپۆڕ باوبوو، بۆیە غەریب ئاغا دەست و پێوەندی خۆی لەدەوری خۆی کۆکردبووەوە، هەرکەسەو سەرو تفەنگێکی تاپڕو دەمانچەی حەفت تیرو خەنجەرێکی بەشان و لاڕان و بەرۆکەوە بوو، جگە لەتانجی و کوتەك.

لێرەدا مژێکی دیکەی لەجگەرەکەی داو لەسەری ڕۆیشت:

- هەرکە ڕاوەپۆڕ بووایە غەریب ئاغا مەفەری بەکەس نەدەدا، هەموو پیاوی گوندەکەی بۆ ڕاو دەبردو چەند

پۆڕیشیان ڕاوکردبایە، ئاغا هەمووی لێ زەوت دەکردن، هیچ هەژارێکیش نەی دەوێرا بڵێت لەل. کە پۆڕەکان بۆ ماڵی ئاغا دەبرانەوە، جوان جوان سووردەکرانەوەو، ئاغاو دەست و پێوەندەکەی چوون گورگی برسی دەکەوتنە وێزەیان .... پۆڕگرەکانیش لەماڵەوە زەقەی چاویان دەهات و منداڵەکانیان هەناسەیان هەڵ دەکێشا.

لالۆ کەریم دیسان گوتی:

ـ ئەو ساڵە من تازە بووبوومە مەلای دێیەکە، ماڵمان لەزنجێکدا بوو خزمێکمان پێی بەخشیبووین. لەڕۆژێکی خۆشدا، هەتاو هەموو لایەکی ڕووناك کردبووەوە، بایەکی فێنك دەهات و دارو دەوەنەکانی دەلەراندەوە، کوت و پڕ بۆ ڕاوەپۆڕ قڕ بەئاواییدا کرا، ئاغاو دەست و پێوەندەکەی و خەڵکی ئاواییەکە ڕوویان کردە چەم، منیش تا ئێستا نەچوومەتە ڕاو، ئەمە یەکەم جارە خۆم تاقی دەکەمەوە، لەناو خەڵکەکەدا لاکەی سەرم دەهات.

کە گەیشتینە چەم، تانجییەکانیان بەرداو ڕاوەپۆڕ دەستی پێ کرد، بووبە هەراو هۆریاو بگرەو بەردە، ئەوەندەی نەبرد گوتیان: سا بیگرە هات، سەیری سەرووی درەختەکانم کرد پۆڕێکم دیت بەرەو من دەفڕی، سووك و ئاسان هات و لەلای بنجە قامیشێکی نزیك مندا نیشتەوەو خۆی کپ کرد، منیش بەپسکە پسك ڕۆیشتم و بەئاسانی توانیم بیگرم و بیخەمە تەنکەی باخەڵمەوە، یەکێك لەڕاوکەرەکان نزیکم بووەوەو پێی گوتم: خۆ پۆڕەکە لێرەدا

نیشتەوە.. تۆ نەت دی؟ منیش گوتم: دیم.. لێرەدا نیشتەوە بەڵام چیی بەسەرهات؟! ئەویش گوتی: لەوانەیە خۆی دزیبێتەوە.

ئیدی کابرام لێ دوورکەوتەوە، هەناسەیەکی شادومانیم هەڵکێشاو دەستی ئۆخەیم بەسەر دڵمدا هێنا.

لێرەدا یەکێك لەمنداڵەکان دەستی بەگریان کردو قسەکانی لالۆ کەریم پچڕێنران، ئەویش ئەمەی بەهەل زانی و مژێکی دی لەجگەرەکەدا، منداڵ ژێر کرایەوە، باس درێژەی کێشا.

ـ نەختێك چوومە ئەولاترەوە ناو بنجە قامیش و تووتڕکەکان دەگەڕام ئەوەندەم زانی دیسان گوترا:ـ ها.. بیگرە.. هات.

سەرنجم دا پۆڕێکی دیکە بەئاسمانەوە بەرەو لای من دەفڕێت، لەپڕ هات و لەنزیکمەوە خۆی خیپ کرد. منیش تا بۆم کرا کوتەکێکم پێدا ماڵی، بەڵام نەمپێکا، هەرچۆنێك بوو کەوتمە دووی و ئەویشم گرت و خستمە تەنکەی باخەڵم هەروەیش نەبوو قیسپە دارێك بەسکمدا بچێت و گەدەو ڕیخۆڵەم بکەونە ئەو ناوە.

پیاوەکانی ئاغا سوارەبوون لەگەڵ ئاغادا چاویان لێ بوو پۆڕەکەم خستە باخەڵمەوە، هەرکە زانیم ئاغاو دەست و پێوەندەکەی چوار دەوریان دام و یەکێك لەپیاوەکانی ئاغا گوتی:

کوا ئەو پۆڕەی گرتت؟ دەری نەهێنیت پەتپەتیی دنیات بەسەر دەهێنین.

منیش بە بەرچاویانەوە دەرم هێنان و هەردووکیانم سەربڕی و دیسان خستمنە باخەڵمەوە.

ئاغا کە ئەمەی دیت، تووڕە بوو، فەرمانی دا لێم بستێنن، بەڵام من سوێندم خوارد نابێت و ناکرێت، ئەو دوو پۆڕە بەکەس نادرێن، چونکە کوڕەکەم سکی هاتووەو گۆشتی پۆڕی بۆ باشە، منیش بۆ ئەومن و کەس چاوی پێیان ناکەوێت. خۆم تووڕە کردو ڕووم لەئاوایی کرد، ئەوانیش وازیان لێ هێنام، کە گەیشتمە ماڵەوە، کەیوانۆکەم زوو پاکی کردن و لێی نان و خەریك بوو سووری دەکردنەوە. ئاغاو پیاوەکانیشی دوای من هەموو هاتبوونەوە، پۆڕەکانیان کۆکردبووەوە، تەنانەت لالۆ فەرەج پۆڕێکی خواردبوو، لەترساندا گوتبووی تانجی خواردوویەتی.

بۆ دواجار مژێکی لەجگەرەکە داو لەسەری ڕۆیشت:

ـ پۆڕەکان لەناو تاوەی سوورکردنەوەدا بوون، ئاغا پیاوێکی بەشوێندا ناردم، پێی گوتم:

ـ ئاغا پۆڕەکانی دەوێت، لەبەرئەوەی مەلا عەباس میوانیەتی بۆیە خۆی نەهات.

منیش پێم ڕاگەیاند: خۆم پۆڕەکانی بۆ دەهێنم، کابرا ڕۆیشت: زۆریشم پێ خۆش بوو مەلا عەباس میوانی ئاغایە.

پـۆڕە سـوورەوە كراوەكانمـان لەسـەر ئـاگر داگـرت و دانـەگرت دیسـان پیـاوی ئاغـا گەڕایـەوە، منـیش پـێم گـوت: فەرموو ئەو ڕانە پۆڕە بەشی تۆیە، كابرا توورەو بوو، گوتی: تۆ گاڵتەمان پێ دەكەیت! ئیدی لێی داو ڕۆیشت.

پاش ئەوەی هەردوو پۆڕ خوران، خۆم ئامادەكردو چووم بۆ دیوەخانی ئاغا.

كـە ڕۆیشـتمە ژوورەوە، خـەڵكێكی زۆری لێ بـوو، ئاغـا پـاڵی دابـووەوە. سـەڵاوم كـرد، وەڵامیشـیان نەدامـەوە، ڕاوەستام، كەس نەی دەوێرا پێم بڵێت فەرموو دانیشە. تا مەلا عەباس پێی گوتم: فەرموو دانیشە.

دانیشتم و دانەنیشتم، لەجیاتی بەخێرهاتن، ئاغا هـەڵی دایەو ڕووی تێ كردم و گوتی:

. كەریم، لەدێیەكدا دوو ئاغا چۆن دەیانكرێت؟

لەوەڵام دا گوتم:

ـ ئاغـا مەبەسـتت ڕوونـە، ببـوورە مـن ئاغـا نـیم، بـۆ مەسـەلەی پۆڕەكـانیش دەڵـێم، ئـەو پـۆڕەی ئێمـە دەیگـرین، وەك گۆشـتی بـەراز بـۆ ئێـوە حەرامـە، چـونكە ئەگـەر مـن قیسپێك سكی دڕیم، تەنیا پۆڕەكە دەبێتە تۆڵەی خوێنم، من هیچ كاتێك ئامادە نیم ئەو پۆڕانە بەتۆ ببەخشم و لەولاوە منداڵەكانم بۆ گۆشتی پۆڕ هەناسە هەڵبكێشن.

ئاغایش گوتی: تۆیش وەكوو ئەم هەموو خەڵكە.

منـیش گـوتم: لەژیانمـدا ڕاسـت بوومـەو ڕاسـت دەڕۆم، بەلای شێردا دەدەم و لەهیچ ناترسم، ئەگەر تۆ پۆڕخۆریـت،

ئەم خەڵکە پۆڕ دەگرن، پارە بدەو لێیان بکڕە، نەك بەزۆر بکەوێتە وێزەی ئەم بێ دەسەڵاتانەو لێیان بستێنیت، ئاخر خوا هەڵناگرێت.. ئەگەر شتێکیان لێ هات.. گوێشیان پێ نادەیت و ناشیان ناسیت، خوێنیان بەفیڕۆ دەچێت.
لالۆ کەریم گوتی: ڕووی قسەم لە مەلا عەباس کردو ئەم پرسیارەم لەبەردەمیدا قوت کردەوە:
. مەلا، تۆو خوا قسەکەم ڕاستە یان نا؟
مەلایش بە بەڵگە ئەوەی چەسپاند کە گۆشتی ئەو پۆڕانە وەك گۆشتی بەراز حەرامەو نابێت بەزۆر لێیان بستێنێت.
ئاغا، کە ئەمەی بیست، بێ دەنگ بوو.. دامرکایەوەو مقی کرد، بەڵام ئەمە بوو بە کینەیەك لەدڵیدا هەر مایەوە.
کە زستان هات پێی گوتم: دێیەك و دوو ئاغایان چۆن گوتووە؟
منیش مەبەستی تێ گەیشتم، لەو گوندە گوێزامەوە گوندێکی دیکە، لەوێ ژنێکم هەبوو لێرە کردم بەدوو! ساڵ هات و ساڵ چوو، دنیا گۆڕاو پاشایەتی گۆڕاو گۆڕبوو، سەری ئاغاو دەرەبەگی تێداچوو، ئێمەیش لەدەستی زوڵم و ستەم ڕزگارمان بوو!

بەغدا . هاوینی ١٩٧٦

# چاوەزار

بە دەستی خۆت نەبوو، خێزانەکەیشت حەزی لە زەنگینی و خانوو و ئۆتۆمۆبیل دەکرد، خۆیشت حەزت دەکرد لە گەڕەکی میللی دوور بکەویتەوەو، لە سایەی دارو درخت و باخچەی فرەوانی گەڕەکێکی فرەوان و پاکژی دەوڵەمەندو خواپێداوەکاندا بەسەر ببەیت، سواری ئۆتۆمۆبیلێکی دوا مۆدیل ببیت و تۆیش خەڵك ئاسا لە کاتی نەورۆزو جەژن و بۆنەکاندا خۆت و خێزانت لەودیوی دەروازەی شارەوە خێوەتی بەهارانەی لێ هەڵدەن و تا ئێوارە چاوی تامەزرۆیی بە سروشتی ڕەنگین بڕێژن. تەماشای دەورو بەرو گەڕەك و شەقام و کۆڵانەکانی شارت دەکرد هەر بابایەو لە ناو کۆشکی ڕازاوە دەژیت و هەر یەکەو ئۆتۆمۆبیلێکی لەبەر دەرگە ڕاگرتووەو کارو ئیشەکانی خۆی پێ مەیسەرو دابین دەکات. تۆیش زیتەی چاوت دێت و زۆرتر هاوسەرەکەت هانت دەدات ئەو ئومێدەی بەدی بهێنیت.

ڕاستە ئەوە چواردە ساڵە مۆڵەتی لێخوڕینت دەرهێناوە، ناشزانیت مۆڵەتەکەت لەماڵەوە لە چ کون و قوژبنێکدا کەوتووەو تۆزی ساڵانی لێ نیشتووەو لەو کاتەوە نوێت نەکردووەتەوەو، هیچ پێشبینی ئەوە ناکەیت ڕۆژێك لە ڕۆژان ئۆتۆمۆبیلی خۆت ببینیت و بە شەقامەکانی شاردا

هاتوچۆی پێ بکەیت و بەیانیان پێی بچیتە دەوام و نیوەڕوانیش بەو قرچەی گەرمایە بایە ساردەکەی پێ بکەیت و بێ ئارەق و ماندووبوون لە فەرمانگەوە بە چاوترووکانێك بگەیتەوە ماڵ و لەسەرخۆ نانی نیوەڕۆ بخۆیت و دواتر سەرخەوێکی بۆ بشکێنیت، بەر لەوەی دەمەو ئێوارە بە ئۆتۆمبیلەکەت بچیتە ناوەندی بازاڕو لەوێ یەك چا یان ساردێکی کەللەتەزێن لە چایخانەی نووسەران هەڵقوڕێنیت و گوێ لە دوا دەنگوباسی وێژەو وێژەوانان و ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسی بگریت. یان ئەو ئێوارە لە گەڵ برادەرە فشەکەرەکەتدا لە یەکێك لە بارەکان یەك دوو پێك هەڵدەن و باسی ئەو ڕۆژگارە بە با بدەن.

هیچ کات بیرت لەوە نەکردبووەوە کە ببیتە خاوەن ئۆتۆمۆبیل، زۆر جار ئەو هەموو ئۆتۆمبیلانەت دەبینی لە شەقامی سەرەکییەوە بەو قەرەباڵغییە یەکسەر دەهاتنە ناو کۆڵانەکانەوە، مووچڕکەت بە لەشدا دەهات و لە دڵی خۆتدا دەتگوت چۆن ناترسن لە ئۆتۆمۆبیلێك بدەن یان منداڵێك بشێلن، بیرت بۆ ئەوە دەچوو ئەگەر تۆ لە بری ئەوان بیت، دەچیت لە گۆڕەپانەکان دەسووڕێیتەوەو لای دەستە چەپ دەگریت و ئەنجا دەڕۆیت تا دەگەیتە ئەو کۆڵانەی لێی دێیتە ژوورەوەو، ژیانی خۆت و خەڵکی ناخەیتە مەترسییەوەو، یەکسەر لە سایدی لای ڕاستەوە ڕاناوەستێت بۆ ئەوەی بچێتە کۆڵانێکەوە، لە کاتێکدا سایدی لای چەپ لە ئۆتۆمۆبیلدا جمەی دێت و ڕی بە

ڕێبواران نادەن نەخواستە ئۆتۆمبیلێك لەو سایتەوە بچێتە کۆڵانەکەوە.

نەك هەر ئەوە ئەوەندە لە قەرەباڵغی ئۆتۆمۆبیلی سەر شەقام و ڕێگەو بانەکان دەترسایت، لای زۆر کەس دەتگوت ئەگەر من ئۆتۆمۆبیل لێ بخوڕم سایدی هێواش و لەسەرخۆ دەگرم و، هیچ کات توند پێ بە بەنزیندا نانێم و لە سەدو بیستی تێناپەڕێنم، زۆر لە ڕێگە پێچاو پێچەکان زەندەقت دەچوو.

تۆ لەم ختووکەو خەونە خۆشانەدا بوویت و ڕۆژگاریش شتی سەیری لێرەو لەوێ شاردبووەوە، تەنانەت ئە پارچە زەوییەی دوای بیست ساڵ فەرمانبەری بە هەزار ناڵی عەلی وەرتگرتبوو، دواتر بە نرخی تۆڵەکە فرۆشتبووت هیچ ئاسەوارێکی ئەوتۆی لە ژیانتدا بەجێ نەهێشت، چەندین جار خێزانەکەت هانی دایت بە پارەی ئەو پارچە زەوییە ئۆتۆمۆبیلێکی تاکسی بکڕیت و بیدەیتە دەستی خزمێکەوە شوفێری باش بزانێت، چونکە خۆت ئەو کات نەتدەوێرا ئۆتۆمۆبیل لێ بخوڕیت و خەونت بەوەوە نەدەبینی ڕۆژگار ئەو چاکەیەت لەگەڵ بکات و ڕۆژێك بێت سواری ئۆتۆمۆبیلی خۆت بیت و شەقامەکانی شار بپێویت. ڕۆژگارێك هاتە کایەوە نە پارەی پارچە زەوییەکەو نەیش ئەو مووچە کەمەی فەرمانبەری کە وەرتدەگرت نەیانتوانی لەو ئابلۆقە چەند سەرییەت قوتار بکەن، کە تۆو خەڵکی بێ دەرامەتی وەك تۆی تێکەوت، تەنانەت بەوەدا دەگەیشتیت

تەنیا وشکەنان بۆ منداڵ و خێزانەکەت دەستەبەر بکەیت و ژینی مەمرەو مەژی پێ بەسەر ببەن و ئەم مانگ بە دەمی ئەو مانگەوە بدەن و لە دوورەوە نەبێت نەتوانن تەماشای زۆر پێداویستی ژیان بکەن، تەنانەت بینایی چاوتان لەبەر گۆشت نەخواردن و گرانی خۆراك و برنج و کەرەستەی سەرەکی ژیان تا دەهات کز تردەبوو، تا دهات بە خۆشتان لەڕو لاوازو بێهێزتر دەبوون.

لەو ڕۆژگارە سەختەدا نە پارەو پوولێکی ئەتۆت هەبوو لە خۆت و ژیانی ڕۆژانەت پتر بێت و نەیش بیرت لە پاشەکەوت و بە خاوەن بوونی ئۆتۆمۆبیل دەکردەوە، تەنیا بیرت لە ژیان و گوزەرانی خۆت و منداڵەکانت دەکردەوە، دەست لە ناکەس پان نەکەنەوەو شەرمەزاری ڕۆژگار نەبن.

ئەو بارە سەخت و دژوارەی تۆو خەڵکانێکی زۆر بەسەریان برد، تا دەهات بەرەو لێژبوونەوە دەچوو، تیشکی هەتاو بریسکەی دا، داڵە ڕەش و گورگەکان لەژێر زەبری شەقی زەمانەدا لەو دەڤەرە شار بەدەر کران، شەوە تاریکەکان بەسەرچوون، دەروازەی خەونەکان کرانەوە، بەهارێکی ئەرخەوانی دەست لە ملانێی سروشتی خەونەکانی دەکرد.

ئەو بەهارە نوێیە پاڵی پێوە نایت کاسێتی خەونەکانی ڕابوردوو لە مێشکی خۆتدا بێنێتە بەر بینین و لەو ئاواتانە ورد ببیتەوەو کە خەونت پێوە دەبینین، ئەگەرچی هیچ سەرمایەیەکت بە دەستەوە نەبوو بیرت لە زۆر پرۆژە

دەکردەوە، بیرت لە فرۆشتنی خانووەکەت دەکردەوە، ئەو خانووەی لێت تاپۆ کرابوو، کەوتبووە ناوچەیەکی بازرگانی شارەوەو هەزارو یەك پرۆژەت لە مێشکی خۆتدا بۆ دانابوو جێبەجێیان بکەیت، خانووەکانی ئەم لاو ئەو لات هەموو پارەی باشیان کردو فرۆشران، خانووەکەی تۆ نەبێت، چوون کیژێکی قەیرەی لێهات و هیچ گەنجێك یان بێوەپیاوێکی بازرگان و سەرمایەدار توخنی نەکەوت.

ملی ئەو ڕێگەیەت گرت، خێزانەکەت مێشکی دەکرووژتیت و قەوانە کۆنەکەی لێ دەدایەوەو، ئەو برینەی دەکولاندیتەوە کە ئۆتۆمۆبیلی خۆت نییەو تا کەی ناتوانیت ببیتە خاوەن چوار تایەو ئۆتۆمۆبیلە شڕەیەك لەبەر دەرگەدا ڕاگریت، تەنانەت ئەم بەهارەی دێت بە خاوو خێزانەوە خۆتانی تێ بئاخنێنن و لەوپەڕی دەروازەی شارەوە جەژنی نەورۆز پیرۆز بکەن.

تا دەهات بازاڕی خەونەکان گەرمتر دەبوو، خوێن دەزاییە دەمارەکان، جۆگەی ئاواتەکان پڕ لە ئاوی بووژانەوە دەبوو، تیشکی هەتاو سەرمەستی دەکردیت، کار گەیشتە ئەوەی مۆڵەتە فڕێ دراوو تۆز لێنیشتووەکەت نوێ بکەیتەوەو، بە ڕاستی بیر لەوە بکەیتەوە کە ببیتە خاوەنی ئۆتۆمۆبیل، ئەو خەونە هانی دایت جارێکی دیکە، پاش ئەو چواردە ساڵە پشت گوێ خستنە بەشداری خولێکی دیکەی لێخوڕین بکەیت و کەمێك زاتی خۆت بشکێنیت.

ئەو چەند گەلآیەی پاشەکەوتت کردبوون، دادی ئەوەیان نەدەدایت ئۆتۆمۆبیلە شرێکیان پێ بکڕیت، بەڵکو ناچار پەنات بەر قەردکردن برد و دەستت لە چەند ناسیاوێك پان کردەوەو، لە پیشانگە ئۆتۆمۆبیلیکی خۆڵەمیشیت کڕی، کە بۆ ماڵت هێنایەوە خۆت لێت نەخۆڕی، ئەو ناسیاوە لێی خۆڕی کە لەگەڵت بوو.

ئەوە ڕووداوێکی گرنگ بوو، خزم و ناسیاوەکان پیرۆزباییان لێ کردیت، تۆیش شیرینیت بەشییەوەو نەتبوو کاوڕێك بکەیتە قوربانی ناچار کەڵەشێرێکتان سەربڕی و بە خوێنەکەی ناوەڕاستی بۆنیدەکەتان سوور کرد، تا نەبێتە چاوەوە، هەر یەکەمین شەو لەبەر دەرگە ئیرەییان پێ بردیت و لە دوو سێ لاوە کیڕاندیان و بە بزمارو دەرەنەفیز بۆیان بریندار کردیت. ئەگەرچی ئۆتۆمۆبیلەکە ئەوەند نوێ نەبوو بەلآم دیمەنێکی جوانی دەنواندو جێی سەرنجی خەڵکی بوو، جاروبار لەگەڵ برادەرە فشەکەرەکەت دەچوویتە ناو شەقامەکانی شارو زاتی خۆت پێ دەشکاند، ئەگەرچی ئۆتۆمۆبیلەکەت هەفتەیەك پتر لای ئەو خزمەت مایەوە کە لە دەرەوە هاتبووە، تۆیش دەتویست زووتر بیبەیتە سەرکارو زووتر خۆت ڕاهێنیت، داوات کرد زوو بیهێننەوە، کە هێنایانەوە، ئەو ڕۆژی هەینییە هەر بەیانی زوو هەستایت و دوای بەرچایی کردن، ناوی خوات لێ هێناو بە شەقامەکانی شاردا تێت تەقاند، لەوپەڕی شارەوە خۆت دیتەوەو گەیشتە بڕوای ئەوەی شوفێری زۆر ئاسانەو هیچ ترس و تۆقینی

ناوێـت، لـەو خەونـە ئەرخەوانیـەدا بوویـت و دەتویسـت لـە شەقامێکی سەرەکییەوە بچیتە ڕێگەیەکی لاوەکییەوە، بەڵام ئـەوەی لێـی دەترسـایت ڕووی داو لـەناکاو کابرایـەك هاتـە بـەردەم ئۆتۆمۆبیلەکـەو لەناوەڕاسـتی ڕێگـە لاوەکییەکـە دەرکـەوت، تـۆیش ئـەو ڕووداوەت لا کوتـوپڕ بـوو، یەکـەم جـارت بـوو تووشـی ئـەم جـۆرە هەڵویسـتە ببیـت، شـڵەژان جڵـەوی لێ سـەندیت، لـە جیـاتی ئـەوەی پـێ بـە ئسـتۆپدا بنێیـت، پێـت بـە بەنزینـدا نـاو دەسـتت بـەرەو لای شۆسـتە ڕاسـت کـردەوە، ئەوەنـدەت زانـی ئۆتۆمۆبیلەکـەت لەناوەڕاسـتی بۆنیدەکەیـدا لـەو شـوێنەوە بـۆ چـاوەزار بـە خـوێنی کەڵەشـێرەکەت سـوور کردبـوو، بـەر ئـەو دارتیلـە زەبەلاحە کەوت لەسەر شۆستەکە بوو، یەکسـەر ڕۆن و ئاوو تێکەڵاو بوون، گریانت هات و لەبەر خۆتەوە خەمێکی گەورە دایگرتیـت، چۆن ماڵـەوە ئاگـەدار بکەیتـەوە کـە ڕووداوێکـی لـەو جـۆرەت لەدەسـت قـەوماوە، چـی بـە بـرادەرو خـزم و دۆستان دەڵێیت، ئەوەی باش بوو کابرات نەشێلاو تووشـی بژاردن و قەرەبووکردنەوە نەبوویت.

پاشـان خـەمی ئـەوە دایگرتیـت چـۆن ئـەو ئۆتۆمۆبیلـەی تازە کڕیوتە چاك بکەیتـەوە، چەند گەڵایـەکت لە ناسیاوێك قـەرد کردبـوو، بڕیـار بـوو ئـەو ڕۆژە بڕۆیـت و بیدەیتـەوەو سوپاسـی بکـەیت، لێ ناچـار بوویـت هـەر هـەمووی لـە چـاککردنەوەی ئۆتۆمۆبیلەکـەدا بچـێتە گیرفـانی فیتـەرو

سکرابفرۆش و تەنەکچییەوەو لە دەمی خۆت بگریتەوەو مانگان قەرد بدەیتەوە.

بەسەرهاتت لەگەڵ ئەو ئۆتۆمۆبیلەدا زۆرو سەیرو سەمەرەیە، جارێك کوڕە گەورەکەت بە دزییەوە دەیبات و جارێکی دیکە کیژە بچووکەکەت ڕووت لێ دەنێت بەیانیان ئەو تا بەردەم دەزگەی فەرمانگە لێی بخوڕیت تا باشتر زاتی بشکێت و بتوانێت باشتر لێ بخوڕێت. ئەو ڕۆژەت لە یاد ناچێتەوە، کە ڕۆژێکی بەر لە جەژن بوو، تۆ داتنابوو لە جەژندا گەشتێکی ناوچەکانی دەورو بەری شاری پێ بکەیت، بیرت لەوە نەکردبووەوە کە جەژنەکەت لێ دەبێتە خەفەت و پەژارە، کاتێك ناسیاوەکەتان پێوەندی پێوە کردیت، تۆ دەتزانی ئەو پێوەندیت پێوە ناکات، یەکسەر دڵت داخوڕپاو چاوت فڕی، تومەز کوڕە گەورەکەت، کە زۆر جار لەسەر ئەوە دەمەقاڵێتانە بۆچی تا گەنجە مۆڵەتی لێخوڕین دەرناهێنێت و خۆی باش فێرە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل ناکات، لەماڵەوە سویچە یەدەکەکەی بردووەو بەو ئێوارەی دوایەمین ڕۆژی ڕەمەزانە سواری ئۆتۆمۆبیلەکە بووەو بازاڕ بمگرەو هاتم. لەخۆبایی بوونی گەنجیەتی و هەست نەکردن بە بەرپرسیاریەتی پاڵی پێوە ناوە تا بتوانێت پێ بە بەنزیندا بنێت، چییە خۆ پێوەی ماندوو نەبووە، خۆ قەردی بۆ نەکردووە، خۆ مانگانە قەرد ناداتەوە، خۆ ئارەقەی بۆ نەڕشتووە، چش با هەرچی ڕوو دەدات با ڕوو بدات، نەك هەر ئۆتۆمۆبیلەکەی تامپۆن پێ

کردووە، بەڵکو لە ئۆتۆمۆبیلێکی دیکەی داوەو، نیوەی پشتەوەی داغان داوە.

ئەگەرچی خاوەن ئۆتۆمۆبیلیش مۆڵەتی نییە، بەلام پارەی دەوێت و دەیەوێت ئۆتۆمۆبیلەکەیشی بۆ چاك بکرێتەوە، هیچ ڕێگەت لەبەردەمدا نەما پەنات بەر قەردو قۆڵە بردەوە، هەردوو ئۆتۆمۆبیل چوونە لای فیتەرو تەنەکەچی و بە چەند گەڵایەك چاك کرانەوە.

ئۆتۆمۆبیلی وات نەبینیبوو، ئەو ڕەنگە خۆڵەمێشییەی ئەوەند سەرنجی ڕادەکێشا بۆ هەر کوێ بچووبایت لێیان دەپرسیت: نایفرۆشیت، تۆیش ناچار وەڵامت دەدانەوە، یەك دوو شتی ئەو ئۆتۆمۆبیلە خەوی لێ هەراسان کردبوویت، با فێنك کەرەکەوەی لە هاویناندا ئیشی نەدەکردو لە گەرمای هاویندا خۆت تێدا نەدەگرت، ژمارەکەیشی سەر بە شارێکی دوور بوو، تۆ ڕێت نەدەکەوتێ. بڕیارت دابوو ئەم زستانە تا هاوین نەهاتووە لەکۆڵی خۆتی بکەیتەوە.

ئەوێ ڕۆژێ فلتەری ڕۆنەکەی کەمێك ڕۆنی لێ دەچوو، برادەرێکی برادەرە فشەکەرەکەت بینیتی دەچیتە گەراجێکەوە کاتێك هۆڕنت بۆ لێداو سەلاوت لێکرد، کە دابەزیت چەند پرسیارێکی سەبارەت ئۆتۆمۆبیلە شڕ لێ کردیت، تۆیش لای خۆتەوە دڵت داخورپاو ترسایت چاوی پیس بێت، دواتر چوویت لای فیتەر فلتەری ڕۆنەکەی چاك بکەیتەوە کە ڕۆنی لێ دەچوو، تومەز فیتەر لە بیری دەچێت

وایەری پەنکەکەی لە شوێنی خۆی ببەستێتەوە، پێی ڕاگەیاندیت چاوت لە ئاوەکەی بێت ئەگەر گڵۆپی سوور پێ بوو ئاوی تێ بکە، تا هێناتەوە هیچ کەم و کورتییەکی نەبوو، چوویت بوتڵە غازێك بکڕیت لە ڕێگە گڵۆپی سوور پێ بوو، ڕاوەستایت ئاوت تێکردو ئیشت پێ کردەوە هیچ کەم و کورتی نەما، کە گەڕایتەوەو لەبەر دەرگە ڕاتگرت، یەکسەر چوویتە سەر کاری ئێوارە.

دوای تۆ ماڵەوە بۆ ئیشی خۆیان، سواری دەبن و بازاڕ بمگرە هاتم، کیژە بچووکەکەت لێی دەخوڕێت، نازانن کە وایەری پەنکە نەبەستراوە، گەرمای ئۆتۆمۆبیل بەرز دەبێتەوەو لەناوجەرگەی بازاڕدا سندووقی گەرم و ساردییەکەی دەتەقێتەوە، تەنانەت پۆلیسی هات و چۆیش دێت بلیتی سزای بۆ دەبڕێت. لەویشدا چاو پیسی کاری خۆی دەکات و فیتەرو وایەرمەن چەند گەلایەکت لێ دەڕووتێننەوە. بڕیارت داوە ئەم ئۆتۆمۆبیلە خۆڵەمێشییە لەکۆڵی خۆت بکەیتەوەو بفرۆشیت، زۆر کەس لە ناسیاوو برادەران ڕایانسپاردوویت پێیان بفرۆشیت، تۆیش ناتەوێت بەوانی بفرۆشیت، ناتەوێت شەرمەزار بیت و هاوین بێن و بڵێن با ساردکەرەوەکەی کار ناکات، چاملوغی ئەم لاو ئەو لای بۆیاغە، بۆنیدەکەی هی خۆی نییە، دوو جار تامپۆنی کردووە، ڕادێتەرەکەی یەك شیشە، گڵۆپەکانی لیزەر نین، مەکینەکەی بوخاری هەیە.

ئەو ڕۆژە زوو هەستایت و چی شتی خۆت هەیە لەناو ئۆتۆمۆیلەکە دەرهێنان و بۆ دوایەمین جار لەبەر دەرگە سواری ئۆتۆمۆبیلە خۆڵەمێشییەکە بوویت و ڕۆیشتیت و خۆت بە پیشانگەیەکدا کرد، لەگەڵ خاوەند پیشانگە ڕێککەوتن و، چەند گەلا لە ئەوو چەندیش لە تۆ پاڵت پێوە نا.

کە گەڵاکانت لە تەنکەی باخەڵت نا، یەکسەر تێتەقاندو ئاوڕت نەدایەوە، دەترسایت ئێستە نا ساتێکی دیکە کڕیار پەشیمان ببێتەوە، دەستت لە نزیکترین تاکسی بەرز کردەوەو خۆت تێ هاویشت، بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتیت و، هەستت بە بار سووکییەك دەکردو ئەو خەم و خەفەتەی جارانت نەما.

کە لە دەرگەی ماڵ ڕۆیشتیتە ژوورەوە خێزانەکەت بە واق وڕماوییەوە پرسیارێکی سەرسوڕمانی ئاراستە کرد.

. ئەی ئۆتۆمبیلەکەت چی لێ کرد؟

کاتێك هەواڵی فرۆشتنیت پێ ڕاگەیاند، ئەیەڕۆیەکی کردو چەپۆکێکی بە گۆنای خۆدا کێشاو بە هەناسەیەکی خنکاوەوە گوتی:

. ئەی ئەم ساڵ جەژنی نەورۆز بە چی بکەینەوە؟

٢٠٠٩/٢/١١

چیرۆکێکی فۆلکلۆری لە (لاوس)ەوە:

# (خام فا) و خاتوونی عاج

هەبوو نەبوو لاوێکی هەژار هەبوو، ناوی (خام فا) بوو، لەگەڵ داپیرەیدا لە خانۆچکەیەکی داڕووخاوی ئەوپەڕی گوندەوە دەژییان.

شەوو ڕۆژ بێ ماندوو بوون ئیشی دەکرد. لەگەڵ ئەوەیشدا نەیدەتوانی پاروویەك نان پەیدا بکات و داپیرەی پێ تێر بکات بۆیە زۆر جار دەستی لەخەڵکی پان دەکردەوە.

لەشوێنێکی نزیکی گوندەکەوە دارستانێکی چڕ هەبوو پێی مرۆڤی پێ نەکەوتبوو. چونکە وا بڵاوبووبووەوە کە ئەجندەی تێدایە.

بەڵام (خام فا) ویستی بچێتە ناو ئەو دارستانەوەو پارچەیە زەویی تێدا پاکژ بکاتەوەو بیکێڵێت. یەکەمین ڕۆژ بەوپەڕی توانـاوە ئیشی کرد، درەختەکانی بڕییەوەو گیاو گۆڵەی لەڕووپێوێکی باشدا داپاچی، پاشان ئێوارە گەڕایەوە لای داپیرەی و سەرکەوتن و کاری ئەو ڕۆژەی بۆ باس کرد. هەردووکیان زۆر پێخۆشحاڵ بوون چونکە لەماوەی ساڵێکدا بڕێکی باشی برنج و گەنمە شامییان دەبێت. بەڵام کاتێك بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر چووە دارستانەکە تا لەسەر ئیشەکە بەردەوام بێت، زۆر سەری سوڕما: چونکە ئەو درەختانەی دوێنێ بڕیبوونیەوە سەر لەنوێ شین بووبوونەوەو گەڵایان کردبوو وەك بڵێیت هیچ شتێك ڕووی نەدابێت.

بەڵام (خام فا) تەوشییەکەی دەست دایەو دەستی بە ئیش کرد تا شەو داهات.

کاتێك ڕۆژی دواتر گەڕایەوە دارستانەکە، هەمان دیمەنی سەیری دیت. بەڵام نائومێدی داینەگرت.. بڕیاری دابوو ئەو ڕووپێوەی دارستانەکە چاك بکات و بیکێڵێت، تا بەروبوومێك پێشکەش بە داپیرەی بکات پێی بژێت.

بەهۆی کار لێ کردنی و سووربوونی ئەو لاوەوە ئەجندەی دارستانەکە بڕیاری دا خۆی لەشێوەی پیرەمێردێکدا پیشان (خام فا) بدات و تەڵەیەکی سیحری پێ بەخشی و، پێی گوت ئەو تەڵەیە لەو شوێنەدا بنێتەوە کە چاکی کردووە، پاشان بگەڕێتەوە ماڵ، لاوەکە، پیرەمێردەکە چی پێ گوت، وای کرد.

ڕۆژی دواتر، کاتێك (خام فا) گەیشتە دارستانەکە (فی نووی) دێوە بچکۆڵەکەی بینی بەتەڵەکەوە بووە.

ویستی بیکوژێت و تۆڵەی لێ بکاتەوە چونکە ئەم (فی نووی)ە، دووجار ئەو کارەی لێ تێك دابوو کە چاکی کردبوو. بەڵام (فی نووی) لێی پاڕایەوە نەیکوژێت و بەڵێنی پێ دا لەهەلێکدا چاکەی بداتەوە. (خام فا) بەزەیی پێدا هاتەوەو بەخشی.

ئیدی لەو ڕۆژەوە کار ئاسایی بەرەو پێشەوە چوو، بەهۆی کۆشش و ڕەنجی بەردەوامی (خام فا) و دان بەخۆدا گرتنیەوە توانیی پارچەیەکی بەرفرەوانی زەوی چاك بکات و، کیڵگەیەکی شینی جوانی مەرەزەو گەنمە شامی بڕازێنێتەوە.

ڕۆژێکیان (خام فا) تۆڕەکەی خستە نێو کانیەکەوە تا هەندێك ماسی بۆ بگرێت. بەڵام کاتێك ڕۆژی دواتر گەڕایەوە دیتی تۆڕەکە هیچ ماسییەکی پێوە نەبووە. کاتێك گەڕایەوە ماڵەوە (فی نووی) دەرکەوت و پێی گوت:

- (خام فا) تۆڕەکەت بخەرە نێو کانییەکەوەو لەیادت نەچێت تەڵە سیحرییەکەش دابنێیتەوە. ئیدی سبەینێ بەیانی بەچاوی خۆت دەبینیت چی ڕووی داوە. ڕۆژی دواتر (خام فا) سەری لەکانییەکە دا شای ئەژدیهای دیت بەتەڵەکەوە بووە کاتێك ویستی لەتۆڵەی کارەکەیدا بیکوژێت، ئەژدیهاکە لێی پاڕایەوە کە بیبەخشێت دووپاتی کردەوە لەدەرفەتێکدا چاکەی بداتەوە. بۆیە (خام فا) بەزەیی پێدا هاتەوەو بەخشی.

کاتێك مەرەزەو گەنمە شامییەکە خەریك بوون پێ دەگەیشتن بڕێك گیانلەبەری کێویلە هاتن و بەژێر پێیانەوە کرد، ئیدی (خام فا) نەیدەزانی چۆن کێڵگەکەی بپارێزێت، (فی نووی) بۆ دەرکەوت و پێی گوت:

- گەورەم (خام فا) تۆ لەبیرت چووەتەوە کە تەڵەیەکی سیحریت هەیە، ئەو تەڵەیە یارمەتیت دەدات و بەر لەگیانلەبەرە کێویلەکان دەگرێتەوە.

(خام فا) چوو تەڵەکەی لەکێڵگەکەدا دابنێتەوە. بەم شێوەیە توانی شای ڕێوییان و شای سەرگەڕان و شای پڵنگان و شای شێران یەك لەدوای یە بگرێت. هەمووشیان لێی پاڕانەوە بیانبەخشێت و بەڵێنیان پێ دا چاکەی بدەنەوە، ئەویش هەمووی بەخشین. ڕۆژێکیان شای فیلان هات و ویستی کێڵگەکە پێشێل بکات تەڵە سیحرییەکە

گرتی و لەبەردەم (خام فا)دا کڕنووشی بردو لێی پاڕایەوە بیبەخشێت: (خام فا) بەزەیی پێدا هاتەوەو ئازادی کرد. بەر لەوەی شای فیلان بگەڕێتەوە دارستان یەکێك لەددانەکانی لێ کردەوەو دای بە (خام فا) و داوای لێ کرد لەشوێنێکی دوور دەستدا داینێت.

ڕۆژێکیان (خام فا) لەگەڵ نەنکیدا چوون کێڵگەکە بەسەر بکەنەوە، کاتێك گەڕانەوە ماڵ دیتیان پاکژ کراوەتەوەو خوانێکی تێرو تەسەلیان بۆ ئامادەکراوەو بۆیان دانراوەو چاوەڕێیان دەکات. وایان زانی (بودا) بۆی ناردوون و بەزەیی پێدا هاتوونەتەوەو، دانیشتنە سەر خوانەکە تا توانییان تێریان خوارد.

ڕۆژی دواتر هەمان شت دووبارە بووەوەو، ئەم دیاردەیە لەڕۆژانی دواتریشدا دووبارە بووەوە.

ڕۆژێکیان، (خام فا) لەگەڵ داپیرەیدا چوون سەر لەکێڵگەکە بدەن، لەنیوەی ڕێگە بەجێی هێشت و خێرا گەڕایەوە ماڵ و لەگۆشەیەکی تەریکدا خۆی شاردەوە.

لەکاتی نیوەڕۆدا کیژێکی جوانی بینی لەددانی فیلەکەوە هاتە دەرەوە، دەستی بە ئیش و کاری جاران کرد، ناوماڵی گسك داو ڕێکی خست و چووە مووبەقەوەو ژەمێك خواردنی بەتامی هێناو لەناوەڕاستی ژوورەکەدا داینا.

(خام فا) زۆری پێ خۆش بوو، هەلی قۆزتەوەو سوودی لەو ماوەیەیە وەرگرت کە کیژەکە دیارنەبوو، دزەی کردە ژوورەکەوەو ددانی فیلەکەی بردو شکاندی. کاتێك کیژەکە گوێی لەم تەقە تەقە بوو ڕای کردو ویستی بچێتە ناو ددانی فیلەکەوە، دیتی تێك شکێنراوە, ئەوکات ڕاستی بە (خام فا)

گوت کە کیژی پاشای فیلانەو باوکی فەرمانی پێ کردووە بچێت خزمەتی (خام فا) بکات و خواردنی بۆ دروست بکات لەپاداشتی چاکەکەیدا. کاتێك (خام فا) بەنهێنییەکەی زانی داوای لەکیژەکە کرد لای بمێنێتەوەو ببێتە ژنی.

(خام فا)ی، بێ باوکی نەدارو، نەدارترین لاوی گوند، بوو بەخاوەن ژن، ژنێکی جوان و دەست ڕەنگین جوانترین و دەست ڕەنگترین ئافرەت لەهەموو وڵاتاندا، ئیدی لەو ڕۆژەوە ئەو ژن و مێردە کامەرانە خۆشترین ڕۆژگاریان لەگەڵ نەنکەکەیاندا بەسەر برد.

بەڵام ئەوەندەی نەبرد، بەدبەختی خەریك بوو ڕووی تێ دەکردن، ئەوەبوو (شاو مۆنگ)ی فەرمانڕەوای وڵات دڵی لەجوانیی ژنەکەی (خام فا) چوو، بڕیاری دا بۆ خۆی داگیری بکات. بەدوای (خام فا)یدا ناردو پێی گوت:

ـ سبەینێ کەڵەشێرەکەت دێنێت چونکە پێشبڕکێی کەڵەشێران ڕێك دەخەین. ئەگەر کەڵەشێرەکەی من دۆڕا جێی من دەگریتەوەو دەبیتە فەرمانڕەوای وڵات، ئەگەر کەڵەشێرەکەی تۆ دۆڕا ئەوکات ژنەکەت دەبێتە ژنی من

(خام فا) گەڕایەو ماڵەوەو خەم و پەژارەی بەسەردا باری، ڕووداوەکەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە. لەو دۆخەی خۆی نائومێد بوو کە لێ دەرچوونی نەبوو. (فی نووی) دەرکەوت و دەربارەی هۆی زیزی و پەژارەی پرسیاری لێ کرد، کاتێك زانی پێی گوت:

ـ گەورەم (خام فا) نیگەران مەبە، سبەینێ باشترین کەڵەشێری شەڕکردنت دەبێت و هەرتۆیش سەر دەکەوێت.

ـ هەقت نەبێت خۆم تەگبیرێکت بۆ دەکەم.

(فـی نـووی) گەڕایـەوە دارسـتانەکەو، بـانگی گـەورەی (ڕێوییان)ی کرد کە پێشتر (خام فا) بەخشیبووی، داوای لێ کرد بچێت یارمەتیی بدات. ڕۆژی دواتـر (خـام فـا) گەیشتە ماڵی (شاو مۆنگ) و (ڕێوییەکی لەگەڵدا بـوو خـۆی کردبووە کەڵەشێر). کاتێك (شاو مۆنگ) دیتـی کەڵەشێرەکەی (خام فا) بچووك و لاوازە گەشایەوەو هـیچ گومـانێکی لا نـەما کـە کەڵەشێرە گەورەو بەهێزەکەی دەباتەوە، کە هـیچ نـەدۆڕاوە، بەڵام بەر لـەوەی یەکـەمین گـێم کۆتـایی بێـت ڕێوییەکـە (کـە خۆی کردبووە کەڵەشێر) ملی ڕکەبەرەکەی شـکاندو دەست بەجێ مردار بووەوە.

(شاو مۆنگ) دۆڕاندی بەڵام خۆی بەدەستەوە نەدا. بیری لەهۆیەك کردەوە کارەکە بەسوودی خۆی بشـکێتەوەو، بـەبێ شـەرمییەوە لەبـەردەم دەسـت و پێوەنـدەکانی و لەبـەردەم ئامادەبووانـدا ڕایگەیانـد کـە کەڵەشـێرەکە مرداربووەتـەوە بەڵام نەدۆڕاوە.

بۆیـە بـە (خـام فـا)ی ڕاگەیانـد کـە سـبەینێ خـۆی بـۆ شەڕەگا ئامادە بکات، کە چارەنووسی سـەرکەوتوو و دۆڕاو دیاری دەکات.

سەرچاوە:
گۆڤاری (لوتس)ی ژمارە (٦٠)ی
پاییزی ساڵی ١٩٨٦ لاپەڕە (٦٨-٦٦)

# ئەوەی ئەو دیوی یارییەکە

نووسینی: ئیدریس ئەلخووری
وەرگێرانی: موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی

سەرەتا، وام بۆ دەرکەوت کە هیچ شتێك لەوە باشتر نییە بە تایبەتی لەم شوێنە دانیشیت : ئاسمانێکی بەرینی نەپەسێنراو، بایەکی فێنکیش لە نێوان پەردەکانەوە دزە دەکاتە دەرەوە، چەندین مافووری ڕاخراوی قەوارەو ڕەنگ جۆراوجۆر، (هەندێکیان دروستکراون). پەردەی پەمەیی، چەند کەرەویتەیەکی بەنەخش و نیگار لە چەند گۆشەیەکدا دانراون، چەند قەرەوێڵەیەکی نزمی بە خوری پف دراو چوون جەستەی داهێزراوی ئافرەتێك نیوەڕۆ ڕاکشابێت، پاشان لە ناوەڕاستی ساڵۆنەکەدا مێزێکی گەورەی لاکێشەیی هەیە، چەند کورسییەکی بە قەدیفەی ئاورێشمی سەوز داپۆشراو دانراون، هەموو شتێك پشوو بەخشەو هەموو شتێك ئاماژەی ئەگەری هەیە.

ئەوە یەکەمین ڕوانینی تێکەڵ بە ترسە، بەلام بێ مەبەستانەیە. هەردوو چاوم لە ناو کاسەی خۆیاندا دەخولانەوە کاتێك لەسەرخۆ هەنگاوم دەهاویشت. بە ڕاستی هەنگاوی لەسەرخۆ بوون، بەو دوو چاوەم بە دوای نزیکترین قەنەفە یان مەندەری خوریدا دەگەڕام، کاتێك جەستەی خۆمم بەسەردا فڕێ دا وام هەست کرد وردە وردە نغرۆ دەبم و زۆر دژوارە بتوانم خۆم لە بنەوەی دەربهێنم کە ببووە قۆرت، بۆیە تا هێزو توانام تێدابوو وەبەر خۆم هێناو خێرا لەشم دەرهێنا، پاشان لە لێواری مەندەرەکە دانیشتم و وەك لە ئامادەباشیدا بم هەردوو لاقم بڵاوکردەوە، ئایە

بمێنمەوە یان بکشێمەوە؟ ئێستە بواری ئەوە نییە، پاشان من خۆم بە ئارەزووی خۆم هاتووم. ئەوان حەزیان لەم کەشە گەورە پڕ لە قەنەفەو کەرەویتەیە، کە جەستەی ماندووی دەستی کاری کارگێڕی پشوو دەدات، ئەم قەنەفە نەرم و نیانانە کە، بۆ یەکەمین جار، یارمەتی مرۆ دەدات نەرم و نیانانەو بەنازەوە ڕاکشێت و لە ناخەوەیش ناز بنوێنێت، کە پەرداخ بە دەستی ڕاستەوە ساردەو، دووکەڵی جگەرەی دافیدۆفیش لەسەر تەبڵە جگەرە شووشەییە ڕەنگ سەوزەکە بەرز دەوبێتەوەو لوول دەخوات و پەرت دەبێتەوە، ژنە گەنجەکەیش، ئەم ئافرەتە جوانە تەمەن سی بەهارە، لەناو ئەو کەشە پڕ لە ئارەزووەدا وەك خانمە نمایشکارێکی جل و بەرگ بەنازەوە دێت و دەچێت، هەرچی منداڵانە ئەوە لە ماڵە تایبەتییەکەی خۆیاندان لە دوایەمین نهۆمی ئەپارتمانی کامەرانی و بە بینینی فیلمی ڤیدیۆیی کات بەسەر دەبەن.

کەچی منداڵان بەردەوام گوێ بەو ڕووداوانە نادەن لە ساڵۆنەکەدا ڕوودەدەن. بایەخ بەو شتان نادەن بە چاوی بەستەزمان و پرسیار ورووژێنەری خۆیان دەیانبینن. بەلای ئەوانەوە شتەکە هیچ جیاوازییەکی تێدا نییە، تەنانەت ئەگەر باوکیان لەگەڵ ئافرەتێکی دیکەدا لە گۆشەیەکی ساڵۆنەکە ببینن، تەنانەت ئەگەر دایکیان بە هۆی هەڵچوونێکی سەرکەرانەوە ماچی کەسێکی دیکە بکات، شتەکە هیچ جیاوازییەکی نییە، جا تا بازووەکان لێرە تێك بئاڵێن و لێوەکان بەیەك بگەن و دواتر ئەو شتەت پێ بگوترێت ئەوە شتەکە هیچ جیاوازییەکی نییە... چونکە ئەم

شەو لای (بەنانی) شەوانی دیکەی پێرا ناگەن. هەموو شەوانی شار گەمەن.

کاتێك من و هاوسەرەکەم چووینە ژوورەوە، خاتوو بەنانی بە گەرمی و بزەیەکی پان و پۆڕەوە پێشوازی لێکردین؛ جگەرە ئەمەریکییە فلتەر زەردەکە خەریك بوو تەواو دەکوژایەوە. خاتوو بەنانی پێشوازی لێکردین و گوتی، بەخێر بێن بەخێر بێن، خاتوو بەنانی درێژەی دایەو گوتی .. بزاف الزین دیالی .. زۆرت بیر دەکەم.. هەردوو بازووە سپیکەلە ڕووتەکەی بڵاوکردەوە، ماچێکی قووڵی هاوسەرەکەی کردم، دەنگی ماچەکە لە دوورەوە بیسترا، وای لێکردم بۆ ئەم ماچە گەرم و گوڕە پڕ خۆشەویستییە ئیرەیی بە هاوسەرەکەم ببەم، خاتوو بەنانی ماچێکی پان و پۆڕو خێرای منیشی کرد، دەستی ڕاستی لە نێو دەستی چەپی هاوسەرەکەمدا بوو، گوتی ئەگەر پرسیارم لێنەکردبان نەدەهاتن، بەڵام هاوسەرەکەم زوو بەرسڤی دایەوە: بە ڕاستی ئێمەیش دوێنێ ئێوارە باسی ئێوەمان کرد، ئەوە (دەمناتی)یە لێی بپرسە، منیش بە ئاماژەیەك بە سەرم گوتم بەڵێ و پاشان فشارم هێنایە سەر خۆم، جا بۆ ئەوەی خۆم لە دەمەتەقێی تایبەتی و نهێنی ئافرەتان تێهەڵنەقورتێنم هاوسەرەکەم بەجێ هێشت لەگەڵ خاتوو (بەنانی)دا بپەیڤێت و هەر یەکەو تێکەڵاوی یەکدی ببن بە شێوەیەك نەمن و نە ئەوانیش شەرمەزار بن، چونکە پێوەندییەکی توندو بەتین لە نێوانیاندا هەیە بەر لەوەی هاوسەرەکەم لە بەشی کارگێڕی بناسم، پاشان هەنووکە دەچنە سەر باسی منداڵان و بەردەست و کارەکەرەکان دەکەن، سەبارەت بە ڕابوردوو و ڕووداوەکانی سەر بە

ڕابـوردوو، سـەبارەت بـە هـاتن و چـوون لـە کـارگێڕی و پێشـوازیکردنی میوانـان ڕۆژ نـا ڕۆژێـك، بـە پێـی میزاجـی مسیۆ بەنانی، لەگەڵ خزمەتکردنیاندا تا نیوەی شەو، ئەو کاتە، خاتوو بەنانی دەڵێت کاتێك هاوسەرەکەم لـەپی چەپی دەخاتـە ژێـر چـەناگەیەوە، دەبێـت تەبڵەکـە لـە پاشـەڕۆکی قونگـە جگـەرە پاکـژ بکەمـەوەو، پەنجـەرەکان دەکەمـەوەو پـەردەکان لا دەدەم تـا دووکەڵەکـە بچـێتە دەرەوەو، بـۆنی مرۆڤە میوانەکان و بۆنی ویسکی بچێتە دەرەوە.

. ئێی ... هاوسەرەکەم گێلانە سەری سوڕدەمێنێت.

ـ بە ڕاسـتی ... دوای شـێوان درێـژە بـە یـاری کارتـاو ویسکی خواردنەوە دەدەن، دەنگیان بەرز دەبێتەوە، لایەنێك نـاڕەزایی دەردەبڕێـت و لایـەنێك خۆشـحاڵ: بردمـەوە، دۆڕانـدم، لەکاتێکـدا ئێمـە دەمەتـەقێ دەکـەین و جگـەرە بـەبا دەدەیـن، یـان بـاس لـە خیانـەتکردنی هاوسـەرانی هاوەڵانـەکانمان دەکـەین، ئاکـام، هەیـە دەباتـەوە.. هەیـە دەدۆڕێـت و نیشـانەی شـەکەتی بـە ڕووە تاشـراوو ئاوساوەکانەوە دەبینرێت: زۆریـان خواردووەتـەوەو زۆریـان قومار کردووە.

هاوسەرەکەم بێ دەنگ دەبێت و بەرسڤ ناداتەوە.

مـەدام بـەنانی جگەرەیـەکی دیکـە دادەگیرسـێنێت و بـە هاوسەرەکەم دەڵێت: شتێك قاوەیەکی سووك؟

پاشان مەدام بەنانی بەرەو مووبەق دەچێت.

لـە دواوە تەماشـام دەکـرد: ئـەم جەسـتە نیوچـە بـەرزە، نەرم و باریکە، جۆرە ئەفسـوونێکی تایبـەتی هەیـەو لـە هـەر سـەردانێکمدا پـترم بـۆ ڕوون دەبێتـەوە، تـا هەنووکـە دوو منـداڵی بـووە، کـوڕو کیـژێك، پاشـان دایانخسـت... لەگـەڵ

ئەوەیشـدا، هێشـتە ئـەم بوونـەوەرە کـە لـە ڕۆیشـتنندا وەك شەپەنگ سووکە، هێشتە بە خۆوەیە، وێڕای ئەو جوانییـەی کـە دەڵێیـت کیـژە، ئەگەرچـی مسیۆ بـەنانی، وەك لـە بەشـی کـارگێڕی بـانگی دەکـەن، بـە ڕواڵـەت بەرانبـەر بـەم جەشـتە باریکەڵە شادومانە، لەگەڵ ئەو بزەیـەی سـەر لێوی کـە هـەر بەردەوامە، بەڵام لـە یادوەری خۆی دەسڕێتەوە هـەر کاتێك جەسـتەیەکی دیکـە ئامـادە بێـت، یـان لــە پەنجـەرەی ئۆتۆمۆبیلەکەیەوە بیبینێت، بە ڕێگەوە لـە بەشـی کـارگێڕی بۆ ماڵەوە، بەردەوام چاو لـە شـانی پـڕو ڕوخسـاری کچـە لاو ناترووکێنێنـت کـە شـەقامەکان دەتەننـەوەو، ئاواتـەخوازە هەموو شەوێك میوانی نوێنەکەی بن: ئەم ئافرەتـەم پـێ داوە بـێ ئـەوەی ئـارەزووی هەڵبـژاردنی بکـات، هەرچـی ڕەتکردنەوەیـە ئـەوە لــە یـادوەری سـڕاوەتەوە لــەوەتای منداڵەکانیان یەك بە دوای یەکدا بووە.

ئەوەتە خاتوو بەنانی بە سینییەك قاوەوە بەرەو ڕوومـان دێت و لە تەنیشـت هاوسەرەکەمەوە دادەنیشێت، درێـژە بە پەیڤینی تایبەت دەدەن، خۆم ناچار دەکەم گوێم لێ نەبێت، کاریان ئەمەیە. جگەرەیەك دادەگیرسێنم و بڕیار دەدەم، بەم دوو چـاوەم، تەماشای ئـەم سـالۆنەو قەنەفـە گرانبـەهاکانی بکەم، لە دڵـی خۆمـدا بـە جۆرە ناخۆشییەکی بـێ سـوودەوە دەڵێم، کەی شوقەیەکی وەك ئەمەم دەبێت؟

. ئەی دمناتی تۆ خەون دەبینیت.

ئەو کـات بـە هاتنـە ژوورەوەی بـەنانی و میوانـەکانی بـە ئاگە دێم.

●

یەکەمین کەس بووین هاتین بۆ ئەوەی بزانین میوانەکان لەوێ نین. ئەوە کاری ئێمە نەبوو، بۆیە هەستمان بە جۆرە شەرمەزارییەك کرد ئەو کاتە دەرمان نەبڕی، بەڵام هەستی بــە نهێنــی سەرســوڕمانمان کــردو خێــرا بەرانبــەرمان ڕایگەیاند: هیچ کێشەیەك نییە، ماڵ ماڵی خۆتانە. ئەو کاتە سەرسـوڕمانمان وەلاوە نـا تـا مسـیۆ بـەنانی و هاوڕێکـانی هـاتن، هەرکـە هاتـە ژوورەوە یەکسـەر ڕوخساری کرایـەوەو هـاواری کـرد: ئـاه ... دەمنـاتی لێرەیـە، بـەخێر بێیـت، زۆر باشت کرد هاتیت، هەستام باوەشم پێدا کردو باوەشی پێدا کـردم و ماچـم کـردو ماچـی کـردم، پاشـان گـوتی دانیشـەو پێشوازی لێکردم، دواتر چووە لای هاوسەرەکەمەوەو ماچی گۆنـای ئەویشـی کـردو لـە شـەرماندا هـەردوو گۆنـای سـوور هەڵگــەڕان، یەکــە یەکــە میوانــەکانی پێشــکەش کــردین: سەعیدو هاوسـەرەکەی، زروالی و هاوسـەرەکەی، سـڵاویان لێ کــردین و ســڵاومان لێ کــردن و، بــۆ گۆشــەیەکی دیکــەی سـاڵۆنەکەیان بـانگ کـردین، کـە کەنەبـەو سـەرینی لێبـوو، بەنانی بانگی هاوسەرەکەی کردو داوای کرد دەفرە بەفرەکە بهێنێـت. پـاش ماوەیـەك سـینییەکی دیکـە دانـراو شـەش پەرداخی کورت کورتی ئەستووری ڕازاوەی لەسەر دانرابوو، تۆیش سەرت گێژ بکەو تەواوی بکە.

سـەرەتا، پێشـبینی ئـەوەمان نـەکرد ئـەم دانیشـتنە بـەم ئامادەبوونە پێشبینی کراوە بێت، بانگهێشتی مەدام بەنانی بۆ ئەوە بوو بۆ شیوخواردن بێین تا یەکدی ببینین، ئەویش پـاش لێکـدابڕانێکی ناچـاری، ئایـا ئـەوەم ڕەت دەکـردەوە ئەگـەر بـەم هـەموو شـتەم زانیبایـە؟ پاشـان چـی دواتـر ڕوو دەدات؟ چــەند پــەرداخێك دەخۆینــەوەو شــیوی ئێــوارە

دەخۆین، دواتر لە بارەی کات و هاوڕێیانەوە دەمەتەقێ دەکەین، ئەوانەی زوو دەوڵەمەند بوون، ئەوانەیش کە هێشتە لە پەراوێزەوەن، ئەوانەی پاڵتۆی خۆیان گۆڕی و بوون بە ئەندامی پەرلەمان و، ئەوانەی دەزانن شانی دەوڵەت لە کوێوە دەخورێت و بێ ئەوەی خۆیان ماندوو بکەن و ئامادە بن، بەڵام هەموو ئەگەرێکم هەڵوەشاندەوە کە ڕێی یێ بچێت، چونکە بەنانی هاوڕێمان لە ئامادەبوونی ئەم شەو تەنیا کات بەسەر بردن دەبینێت، با پاش ئەوەیش زریان بێت، بۆ نا؟

. چین چین.

. بۆ تەندرستی ئێوە.

ئافرەتەکان بە تەنیا بوون، ئێمەیش تەنیا بووین. ئەوان بە خۆیان وایان ویست بەم شێوەیە تەنیا بین، بەنانی منی پێشکەش بە هەردوو هاوڕێ لاوەکەی خۆی کرد، گوتی ئەمە مامۆستایە، برادەری منداڵیمە. بزەم هاتێ و ئەو دوانەکەیش بزەیان هاتێ. خەسڵەتی کارگێڕییەکی داخراویان پێوە دیار بوو، هەردووك شەرمن بوون و لەهەر هەڵچوونێکی زمانەوانیدا وشیارو بە ئاگە بوون. بە فەرەنسییەکی سووك پەیڤین و تەماشای (بەنانی)یان کرد، ئەویش بە هەردوو چاوە وریاکانی وەڵامی دانەوە کە بەنانی لەو کەسانە نییە پێی بگوترێت ئەی خەڵکینە، لەکاتێکدا ماوەی وەهمی نێوانمان بەردەوام بوو، ئەوە خەریك بوو بە سووتانی ساتەکان بەسەر دەچوو، ئەو کات یەکێکیان جگەرەیەکی قاوەیی پێدام، (بەنانی)یش خێرا فەندەکە زێڕینکەی بۆ لای دەمم نزیك کردەوە، منیش بە (بەنانی)م گوت سوپاس، پەرداخەکەی خۆم هەڵدا.

زروالی کەمێك بۆینباغەکەی ملی شل کردەوەو گوتی: ئێوارە کۆرەکەکی دوێنێ شەو خراپ نەبوو، کەمێکمان خواردەوە دواتر وەك جاران یاری کارتامان کرد، لە بەدبەختی بوو من دوو هەزار درهەمم دۆڕاند لە کاتێکدا سەعید پێنج هەزاری بردەوە، پاشان تەماشای فیلمی (ویستێرن)مان کرد.

بەنانی: شتێکی ئاساییە، جارەکەی دی شەش هەزارت دۆڕاند. خۆتێهەڵقورتاندنی زروالی: ئەوە پۆکەرە ڕۆژێك لەگەڵتەو ڕۆژێك دژتە.

هەرسێکیان دایانە قاقای پێکەنین و درێژەیان بە خواردنەوە دا، بەنانی ئاوڕی لە ئافرەتەکان دایەوە کە لەوێ بە تەنیا دانیشتبوون و ڕووی قسەی کردە هاوسەرەکەم: لەکوێ بزر بوویت ؟ . لە کازابلانکا، لێرە. بزەیەکی بەرین کەوتە سەر لێوی ئافرەتەکان.

منیش وردە وردە خەریك بوو بە کەش و هەواکە ڕادەهاتم و، بە هۆی گەرماوە دەبووژامەوە. لێرەو لەوێ هیچ جیاوازییەکی نییە، چی بەسەرتدا دەسەپێنێت لێرە بیت؟ ئەو خودپارێزییە سەرسوڕهێنەرەم لەسەر خۆم لاداو چاوەڕێی ئەوەبووم سات بەخۆی گەشە بسێنێت. چەند قومێکم خواردەوە. جگەرەم کێشا. دزە نیگام دەخستە سەر ئافرەتەکانی دیکە. سەرەتا، هاوسەرەکەم لە ئەندێشەی خۆم دەرهێناو، دەستم بەوە کرد، جاروبار تەماشای خاتوو بەنانی و هەردوو دەستەخوشکەکەیم کرد کە جل و بەرگی پۆشتەیان لەبەربوو. هەردوو ئافرەتەکە پێچەوانەی یەکدی بوون، بەلام هاوسەرەکەی زروالی لاواز بوو چوون دارخورمایەك گەلای پێوە نەبێت. لە ناویاندا هاوسەرەکەی

من نەیدەخواردەوە، پەرداخێك ویسكی لەبەردەم خاتوو (بەنانی)دا دانرابوو، ئەو دووەكەیش هەر یەكەو بیرەیەكی لەبەردەمدا دانرابوو.

سات تا دێت زلتر دەبێت و دەگاتە بنمیچ. ئێمەیش ماوەی وەهمی نێوانمان لادەبەین تا پتر تێكەڵاوی یەكدی بین. بەنانی هاوڕێمان بە تەنگی ئەوەوە بوو هەموومان ڕازی بكات، نەماندەتوانی (یان ڕاستتر نەمدەتوانی) سەرپێچی بكەین ئەوە نەبێت مل بۆ ئەم ڕێ و ڕەسمە جیاوازە كەچ بكەین. بەڵام من نەمویست لە قۆستنەوەی ئەو هەلەدا پێشەنگ بم. چ زیانێك دەكەم ئەگەر تا بەیانی بمێنینەوە؟ ئەدی ئەم ئێوارەیە ئێوارەی شەممە نییە؟

بەنانی پێشنیازی كرد: پەرداخێكی دیكەی بەسەردا دەكەین، پاشان نان دەخۆین؟

زروالی بەرسڤی دایەوە:

- شیو دەخۆین و دواتر شتێكی دەخەینە سەر.

- وایە.

بەنانی چەپڵەی بۆ ژنەكەی لێدا: شیو.

هەموومان بەرەو مێزەكە هەستاین و ، هەموومان پەرداخەكانمان بە دەستەوە بوو.

●

سەرەتا، دەبوو سەر بۆ پێشنیاركەی بەنانی دانەوێنم كە پێویستە بەشداری لەم یارییە گاڵتەجارییەدا بكەم. ڕەتم كردەوە، بەڵام بێ ئەوەی پاساوێك بۆ بەنانی بهێنمەوە قایلی بكات، بۆیە پرسیم: ئەم یارییە چی دەگەیەنێت، من بەشداری تێدا بكەم چی دەگەیەنێت؟ كاتێك دەفرەكان لابران و نایلۆنی سەر مێزەكەیش لابرا بوتڵە ویسكییەكە هێنرا كە

تا نیوەی مابووەوە، پاشان پەرداخەکان نوێ کرانەوەو پارچە بەفر خرایە نێو دەفرەکەیەوەو، هەموویان خۆیان بۆ کۆمیدیای ڕۆژانە ئامادە کرد. هەموو ڕۆژێك ئەم کارە دەکەن. ئەوەم لە (مەدام بەنانی)یەوە بیست کاتێك بۆ هاوسەرەکەمی باس دەکرد، کاتێك بۆ (بەنانی)م ڕوون کردەوە کە من هیچ گوێ بەو یارییە کۆمیدییە نادەم، پێکەنی و گوتی: تۆ تاقی بکەوە، ڕەنگە قازانج بکەیت.

. کەواتە کارەکە پێوەندی بە پارەوەیە؟

. چۆن چۆن.

لە لایەکی دیکەوە هاوسەرەکەم بێ دەنگ و مات بوو، هەردوو چاوی ئەبڵەق بوون. لە بەیانییەوە تا ئێوارە ڕاپۆرتێك سەبارەت وشکەساڵی و تەنگژەی ئارد کۆپی دەکاتەوە، ئێستەیش کە پشوو دەدات وا هەست دەکات لە دەرەوەی بازنەکەیە، لە تەنیشت مێزەکەوە پیاوان دانیشتوون، لەسەر قەنەفەکانیش ئافرەتانی فووتێکراو هەن شانازی بە مێردە کارگێڕەکانیانەوە دەکەن.

دەم و چاوی مەدام بەنانی گەنم ڕەنگە، هەردوو چاوی چوونەتە قووڵداو بریسکەیان دێت، بەڵام ئەو دوانەکەی دیکە وا دێنە بەرچاو لە دەرەوەی سەردەمی خۆیان بن، هاوسەرەکەیشم دەکۆشێت تێکەڵاویان بێت و زۆربێژییان لەگەڵدا بکات بێ ئەوەی بڕوایشی پێ بێت.، ئایە ئەم یارییە دەبێتە هۆی ئەوەی سەهۆڵەکە بتوێتەوە تا هەموومان بچینە ناو یەکدییەوە؟

تەماشای هەردوو پیاوە لاوەکە دەکەم دەخۆنەوە. جگەرە دەکێشن. نزیکم دەبنەوە تا پتر تێکەڵیان ببم، ئەمڕۆ ئەمەیە چارەنووسم: یارییەکە باش بزانم یان بکشێمەوە،

کاتێك بەنانی پاپەزەکەی هێنا، بە ئاسانی چۆنیەتی یاری کردن و ژمارە نەدۆڕاوو دۆڕاوەکانی بۆ ڕوون کردمەوە، گوتیشی تۆ هەنووکە لەم دوو پڵنگە دەرهاوێژراویت، چونکە ئێمە هەموومان لەسەر ئەوە ڕاهاتووین بە پارە یاری بکەین.

زروالی گوتی: ئەگەر دۆڕاین؟

بەنانی وەڵامی دایەوە:

. بەنانی دەباتەوە. پاشان پێکەنی و چاوی لێ داگرتم.

سەعید قسەی ئاراستە کردم:

. یاری کلیلەکان دەکەین.

. ئۆتۆمۆبیلت هەیە؟

. بەڵێ.

. شتێکی باشە. پەرداخەکەی بەرزکردەوە.

تا هەنووکە نازانم چی لە بەردەممدا ڕوو دەدات؟ ئێمە هاتین بۆ ئەوە بانگهێشت کرابووین شیوی ئێوارە بخۆین و دوای دابڕانێکی ناچارانە یەکدی ببینین، شار بە کاتی فشاربەخش و، ڕۆیشتنی خێراو کوشندەی خۆی لە سەروومانەوە بوو، بەڵام ئەوانە کاتیان نییە، بەم شێوەیە تێگەیشتم بۆچی بەنانی ئەم ماوە دوورو درێژە لەبەرچاوم ون دەبێت؟

پاپەزەکان دابەش کران و یاری دەستی پێ کرد، لە دەرەوەو ناوەوەی بازنەکە بووم، ئافرەتەکان سەبارەت بە ڕۆژانی پشوو و جەژنەکان، پێوەندی و فیلمی ڤیدیۆیی، ئافرەتە گۆرانیبێژە مەغریبییەکان و ئافرەتە کۆرانیبێژە میسریەکان، سەبارەت بە یەکەی نیشتەجێ و بازاڕکردن و، گەڕەکی دەوڵەمەندەکان و، دەستە خوشکە تەڵاقدراوەکانیان

دەدوان کە مێردەکانیان لەگەڵ هاوڕێکانیاندا گرتنیان و دواتر لەبەر ئابڕووچوون لێیان بووران. پیاوەکان زۆر لەسەرخۆ تەماشای پاپەزەکانیان دەکردو چاوەڕێ بوون یەکێکیان پاپەزەکانی خۆی ئاشکرا بکات کە بردوویەتییەوە. دەخۆنەوەو جگەرە دەکێشن. منیش وەك ئەوان دەکەم. قووڵ ڕادەمێنن تا فێڵێك بدۆزنەوە. ئەمە یارییەکەیە. بەنانی گوتی ئەمە تەنیا ڕاهێنانەو بۆ خۆت فێر بە، ئەی دەمناتی جوان ئەدی وا نییە؟

. بەڵام ئۆتۆمۆبێلم نییە؟

. کێشە نییە، سویچی ئۆتۆمۆبێلی ژنەکەمت پێ دەدەم کە ئاڕ ١٢یە.

. چۆن؟

ـ تا کۆتایی یاری دەکەین و دواتر سویچەکان تێکەڵاو دەکەین.

. چۆن؟

سویچەکان تێکەڵاو دەکەین و چاوەڕوانی ئاکام دەبین.

. چۆن؟

ـ ئەگەر سویچی ئۆتۆمۆبێلەکەم کەوتە لای تۆ، یان سویچی ئۆتۆمۆبێلی هەر کەسێك، دەبێت یەکێك لە ئافرەتەکانت بەر بکەوێت، بە پێچەوانەیشەوە.

. وا پێدەچێت یارییەکە ڕاستەقینە بێت.

. بەڵێ، تەنیا یارییەکی گاڵتەجاڕییە. ئێمە بەردەوام ئەوە بۆ ڕابواردن و کات بەسەربردن ئەنجام دەدەین.

شڵەژام، لەگەڵ ئەوەیشدا بە تەواوەتی نەمزانی چی لەبەرچاوم ڕوو دەدات ؟ ڕەنگە یارییەکە بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی ڕوو بدات، بەڵام سویچەکان یارییەکی

ڕاستەقینەیە، هەستم کرد کە سکم پڕ لە ئاو بووەو، سەریشم خەریك بوو گێژ دەبوو. جێم هێشتن یارییان دەکردو بەرەو توالێت ڕۆیشتم، لەو سات و زۆربێژییەدا بەرەو دوور ڕۆیشتبوون و تا دەهات دەنگیان بەرزتر دەبووەوە. لە توالێتەکە دەم و چاوی ئاوساوی خۆم شوشت و بینی. هەڵوێستی هاوسەرەکەم چی دەبێت کاتێك تەك یەکێکیان بکەوێت؟ کاتێك پاش بووژانەوەیەکی کەم، گەڕامەوە سالۆنەکە، سویچەکانم بینی لەسەر مێزەکە دانرابوون؛ یارییە ڕاستەقینە گاڵتەجارییەکە دەستی پێکرد. بە ئەنقەست لە نزیك ئافرەتەکانەوە دانیشتم، مەدام بەنانی گوتی:

- یارییەکەت بەدڵ نییە؟

- بەڵێ، لێی ڕادێم.

هەستاو هاتە ئەو شوێنەی لێی دانیشتبووم و پەرداخە تا نیوە پڕەکەمی بۆ هێنام، لە چەرە دووکەڵدا چاو چاوی نەدەبینی، نزیك مەدام زروالی دانیشت و، لە تەنیشت خۆیەوە شوێنێکی بۆ کردمەوە جێی تەسك نەکاتەوە (بەڵێ باریکەلەیە). ڕاکشام و پێشوازی لێ کردم، دڵی سێ گۆشە بوو، چوون دڵ، هەردوو چاوی نیوە نووقاو. لاق لەسەر لاق، کراسە نەخشێنراوەکەی تا لای هەردوو لاقە وردەکانی دادرابووەوە کە لە ناو پێڵاوێکی پاش بەرزدا بوون.

گوتی: حەزت لە پۆکەر هەیە؟

- نا، حەزم لە هاوارکردنە.

- پێدەچێت برادەرێکی گیانی بە گیانی بەنانی بیت؟

- بووم.

- ئەی ئێستە؟

. وەك دەبینیت: لە ناوو دەرەوەی هاوڕێیەتیدا.
جگەرەیەكی بۆ درێژ كردم گوتی ئەمە بكێشە. حەز دەكەم بۆ كەسانی جیاوازی وەك تۆ قسە بكەم.
بەنانی هاواری كرد: بەسەرهاتی ئافرەتانت بیستووە؟ سویچەكەت چاوەڕێت دەكات. وەلامم دایەوە: ئۆتۆمۆبیلێكی دیكەی پێ لێ بخوڕە. ویستم هەستم و بچمە لای مێزەكەو یارییەكە ئاشكرا بكەم، بەلام مەدام زروالی مەچەكی گرتم و گوتی : لێرە لە تەنیشتی من بمێنەوە، ئەوان تەنیا بۆ خۆیان یاری دەكەن.
. ئەی هاوسەرەكەم؟
. ئەویش دەمەتەقێیان لەگەڵ دەكات. بزەیەكی ساردی هاتی، شتێكی لەو جۆرە ..
مەزەندەم دەكرد كارەكە بەرەو ئاراستەیەكی دیكە دەڕوات، چی ئەگەر هەستامایەو بچوومایەتە لای مێزەكە كە یاری سویچەكانیان دەكردو چی لای مەدام زروالی بمایەمەوە ئەوە هیچ جیاوازییەكی نەبوو: لەوێ یاری هەیەو لێرەیش یارییەكی دیكە. ئەمە ئەو كەش و هەوایەیە كە ڕۆژانە لێرەو لەوێ دەكرێت. پێوەرەكانیش گرنگ نین. سویچ هەن و كونیش هەن. من ئێستە سویچم ئەی كوا ئۆتۆمۆبیل تا سواری ببم؟ مەدام زروالی پێی گوتم با تۆزێك بچینە دەرەوەی بالكۆنەكەی دیكە. ئەوێ كەش و هەوایەكی دیكەی هەیە. سروەیەكی شەوانەی فێنك بە هۆشی خۆمانمان دێنێتەوە. ڕاوەستاین، ئەویش لە تەنیشتمەوە ڕاوەستابوو. كازابلانكا ڕووناك و بەرین بوو. ڕەنگە لە زۆر لە مالان و ڤێلاكانیدا زۆر سویچ هەبن و زۆر تۆمۆبێل هەبن چاوەڕێ بن سواریان بن، تەنانەت ئەگەر سویچەكانیش

تێکەڵاو بن، تەنانەت ئەگەر ئەم شەویش شەوێکی هەڵە بێت، هەموو شەوانی شارەکە سویچن. ئایە ئەم شەو سواری یەکێکیان ببم؟ ئەوان بۆ خۆیان لە ناوەوە غەڵبە غەڵبیان بوو، ئێستەیش مەدام زروالی خۆی بەسەر شوورەی بالکۆنەکەدا داوەو دەڵێت: بە ڕاستی شەوی ئەم شارە جوانە. وەلامم دایەوە: بەلام ئۆتۆمۆبێل پێویستە.

- گوتی: لەم یارییە دووبارە بێزار بووم. هەر ڕۆژەو لە باسێکدام. هیچ لە گۆڕێ نییە تەنیا کەللەسەرو پۆکەر نەبێت. هەست دەکەم کاتم لێ دەرباز دەبێت.

تەماشای ڕووناکییەکانم دەکردو خۆم وا پیشان دەدا گوێم لێ نییە. کێ دەڵێت یارییەکی ڕاستەقینە نییە. لێم نزیك بووەوەو دەستی گرتم: تۆ زۆر گەرمیت. پتر لێم نزیك بووەوە. ئاورم دایەوەو ورد لە ناو چاوانیم ڕوانی. لەو دوو چاوە خەواڵووە ئارەزوویەکی خنکاو تیشك دەداتەوە، ڕەنگە پلانی ئەوە دانرابێت من ئەڵتەرناتیڤێك بم.

- هاوسەرەکەی خۆتت خۆش دەوێت؟

- لافی ئەوە لێ نادەم، بەلام لەسایەی یەك بنمیچداین.

- چۆن چێژو ئەرك تێەکەڵاو دەکەیت؟

- چێژ لێرەو، ئەرك لەوێ.

- تۆ وتارێکی تایبەتت هەیە.

- نازانم.

- خۆی پێوەم نووساندو، گوتی من ئۆتۆمۆبێلی تۆم، ئارەزووم ئەوەیە سوارم ببیت.

- ئەی سویچەکە؟

- لای خۆتە.

سـلفێکم لێ دا، ماشـینەکە وەگـەڕ کـەوت، شـارەکە ڕێگەیەکی والآ بوو، نە ترەفیك لایت و نە بەرەبوست هەبوو. نە پۆلیس و نە ئاسایش. چەند ئۆتۆمۆبێلێك لەلارێ پەکیان کەوتبوو خاوەنەکانیان لە ژێر بۆدییەکانیاندا بوون. سروە فێنکەکـە بـە هۆشـی هێناینـەوە، خێراییمـان کـەم کـردەوەو گەڕاینـەوە سـالۆنەکە. ئـەوان یاریەکـەیان تـەواو کردبـوو و سویچـەکانیان تێکـەڵ کردبـوو، بـەناوی منـەوە یارییـان کردبوو بێ ئەوەی بەشدارییان لەگەڵ بکەم. لە خۆشبەختیم بوو سویچەکەم بەر بەنانی کەوتبوو، بۆیە بە پێکەنینێکی هستیریانەوە ڕایگەیانـد کـە ئێمـە تـەنیا بـۆ گاڵتـەمان بـوو، ئەدی پێم نەگوتی تەنیا یارییەو بەس؟

سەرچـاوە: گۆڤـاری (الکرمـل) ژمـارە (١٨)ی سـاڵی ، ١٩٨٥لاپـەڕە (١٧٢ ـ ١٧٨) ، سەرنووسـەر: مـەحموود دەرویش، سکرتێری نووسین: سەلیم بەرەکات. لە نیقۆسیا ـ قوبرس چاپ کراوە.